## پێشکەشە

بەسەرچاوەی ئەو بەخششەی کە گیانی کۆشش و بەمەبەست گەیشتنی لە دەروونمدا ڕواند...

خوالێخۆشبووی باوکم

ناوی کتێب: کێڵگەی شەرم... مین
نووسینی: ئەمیری حاجی داود
پێشەکی: سەروان بارزانی
نووسینی سەر بەرگ: ئەمجەد خەتات
دەرهێنانی ناوەوە و بەرگ: ئاراس ئەکرەم
هەڵەگری: دلشاد مستەفا
سەرپەرشتیی چاپ: ئاورەحمانی حاجی مەحموود
چاپی یەکەم ، هەولێر - ٢٠٠٤
چاپخانەی وەزارەتی پەروەردە
لە کتێبخانەی بەڕێوەبەرایەتی گشتی ڕۆشنبیری و
هونەر لە هەولێر ژمارە (٤١٥) ساڵی ٢٠٠٤ی دراوەتێ.

# پێشەکی

لە زانکۆ، مامۆستا داوای لێکردین هەریەکە و راپۆرتێک بنووسین، جا ئەو ڕاپۆرتە لەسەر هەر چییەک بێت. بەڵام بە مەرجێک ڕاپۆرتێکی تێروتەسەل بێت. بیرم کردەوە باشترین شت کە شایەنی نووسین بێت مەینەتەکانی گەلی کوردە، چونکە کورد تووشی زۆر مەینەتی هاتییە لە سەرەتای داواکردنی مافەکانی خۆیەوە تاوەکو ئێستا، یەکێک لە مەینەت و ئازارەکانی گەلەکەشم (مین)ە کە زۆر گرنگی پێ نەدراوە تا ڕادەیەکیش شتی ئەوتۆی بۆ نەکراوە.

لەو کاتەی کوردستان بەبێ ڕەزامەندی خەڵکەکەی دابەش کراوە شەڕ و پێکدادانی لێ ڕوودداوە و بووەتە مەیدانی ڕووداو و مەیدانی تاقیکردنەوەی چەکەکان، لەنێو ئەم چەکانەشدا (مین) بەشێوەیەکی فراوان لە بەرزایی لوتکە و کێڵگە و لەسەر ڕێگای گوندەکان چاندراون. مین نەک تەنها بۆ مرۆڤ بەڵکو بۆ هەندێ گیانلەبەری کێویش زیانێکی زۆری هەبووە تەنانەت نەمانی ئەو گیانلەبەرە کێوییە گەورانەی کوردستان لە ئەستۆی مین چێنەرەکان دادەنرێت.

مین وەکو چەکێکی کوشندە و ترسناک هەڕەشەیەکی بەردەوامە بەڕووی مرۆڤا، بەتایبەت لەو وڵاتانەی بەدەست شەڕەوە دەناڵێنن. ئێستا لەسەرانسەری

جیهاندا پتر لە (٧٠) ولات بەهۆی بوونی مین لە حاڵەتێکی ترسناک دان.

سەرەتای مین لە کوردستان دەگەڕێتەوە بۆ سەرەتای شۆڕشی ئەیلول، ئەوەی زانرابێت هەموو هەوڵێکی کورد لەلایەن داگیرکەرانی کوردستانەوە بەئاگر و ئاسن وەڵام دراوەتەوە و کورد نەیتوانیوە بەئامانجەکانی بگات. بەپێچەوانەی ئەوان گەلی کورد هەرگیز تا زۆریشی بۆ نەهاتبێ وەڵامیانی نەداوەتەوە، تا بۆی کرابێ هەوڵی داوە بە ئاشتی بگاتە مافەکانی خۆی. بەڵام لە عێراق هەرگیز کەسێک نەهاتووە دان بەمافەکانی گەلی کورد بنێت هەریەکە و بەجۆرێک ئازاری ئەو میللەتەی داوە، ئەو تەنگژە سەربازییەی نێوان رژێمی عێراق و ئێران لە هەشتاکان و شەڕی دووەمی کەنداو و هەروەها شەڕی ناوخۆی کوردستان کاریگەری نیگەتیڤانەی کردۆتە سەر هەموو بوارەکانی ژیان.

دوای ڕاپەرینی (١٩٩١) و گەڕانەوەی خەڵکی بۆ سەر زێدی باب و باپیرانیان، مین بووە گەورەترین هەڕەشە بۆ خەڵکی گەڕاوەی گوند و ناوچە چۆڵکراوەکانی، چونکە ڕێگا و ڕەز و باخ و مەزارەکانیان بە مین داپۆشرابوون، نەدەیانتوانی کشتوکاڵ بکەن و زەوییەکانیان بکێڵن نەدەوێران مەڕ و ماڵاتیان لە لەوەڕگاکاندا بلەوەڕێنن. هەر ناوچەیەک لەم کوردستانە بووەتە بەپارچەیەک لە

مین، ئەو مینانەش قوربانی زۆر زۆر بووە تەنانەت کەس نەیتوانیوە زەویوزاری خۆی بەکاربێنێ ئەمەش بواری گەشەکردنی ئابووریی لە کوردستان بەگشتی و لە گوندەکان بەتایبەت بەهۆی ئەو مینەوە لە وەستاندووە.

هەڵگرتنەوەی مینیش لە کوردستان زۆر کێشەی هەیە، چونکە زۆربەیان لە مادەی پلاستیک دروست کراون ئەم ماددانە کێشیان سووکە وا دەکات بەهۆی بەفر توانەوە لە شوێنەکانی خۆیان بگوازرێنەوە، یاخود بەهۆی شەپۆلی رووبارەکان دەگوازرێنەوە جگە لەمانەش زۆر لە مینەکانی کوردستان لە مادەی ئاسن پێک هاتوون ئەم ماددانەش زۆریان ژەنگیان هەڵێناوە و لە کاتی دەرهێناندا کێشە دروست دەکەن.

چەندین ساڵ بەهۆی ئەو مینە منداڵ و ئافرەت و لاوی کورد بۆتە قوربانی، چەندین شۆڕشگێڕی فەوتاندووە و بۆتە قوربانی.

مین گەشەسەندنی ئابووری کوردستانی لەسەرخۆ کردووە چەندین کەسی تووشی نەخۆشی دەروونی کردووە.

کورد زۆری شەهید و زۆر قوربانی داوە لە ڕێگای گەیشتن بەمافی ئازادی خۆی، چەندین شار و گوندی بەر ژەهری کیمیاوی کەوتووە خەڵکێکی زۆری ئەنفال کراوە. کەسوکاری ئەنفال و ژەهری کیمیاوی

و شەهیدان تا ڕادەیەک شتی بۆ کراوە، کەچی تاوەکو ئێستا کەسوکاری قوربانیانی مین شتێکی ئەوتۆیان بۆ نەکراوە، بەهیوای ئەوەم ئەوانەی بوونەتە قوربانی مین، حکوومەتی هەرێم وەکو شەهیدی کوردستانیان بژمێرێت، چونکە ئەوانیش هیچیان کەمتر نییە لەوانەی کەوا بوونەتە قوربانی ژەهری کیمیاوی و ئەنفال، کەسوکاری ئەم قوربانییانە قەرەبوو بکرێنەوە. ئەوانەی کەوا دەست و قاچیان بەهۆی مینەوە لە دەستداوە شتیان بۆ بکرێ.

لە کۆتاییدا زۆر دڵشاد بووم کەوا بۆ یەکەمین جار کتێبێک بەکوردی دەربارەی مین ببینم هیوادارم ئەم کتێبە بتوانێ کەلەنێک لە کتێبخانەی کوردی پڕ بکاتەوە.

سەروان بارزانی
٧ تەموزی ٢٠٠٤
لەندەن

## بۆچی مین

کوردستان بەچەندین شێواز و هۆکار هەڕەشەی لێ کراوە ئەنفال و گازی ژەهراوی و گرتن و بڕین و جینۆسایدی خەڵکەکەی زۆر باسی کراوە هەرچەندە حەقی خۆشی پێ نەدراوە، بەڵام یەکێک لە کارە هەرە دزێو و نامرۆییانەی کە دەرهەق بەگەلی کورد کرابێت، بەتایبەت لە ساڵانی دوای ١٩٦٠ەوە مینرێژکردنی خاکی کوردستان بووە لەلایەن رژێمە یەک لە دوای یەکەکانی عێراقەوە، بەشێوەیەک کە لە رووی سایکۆلۆژی و کۆمەڵایەتی و ئابوورییەوە کاریگەری و ئاسەواری زۆری بەسەر مرۆڤی کورد لە زۆر ناوچەی کوردستاندا هەبووە و وای کردووە کە لە هەموو هەنگاوێکی خۆی بەگومان بێت. لەگەڵ ئەوەشدا زۆر بەکەمی باس لەو کێشەیە کراوە کە رۆژانە چەندین کەس دەبنە قوربانی و ئەندامێکی لەشیان لە دەست دەدەن و پەکیان دەکەوێ.

لە دەقی بەندی سێیەمی جاڕی گەردوونی مافی مرۆڤی ساڵی ١٩٤٨دا هاتووە: (هەر کەسێک مافی ژیان و ئازادی و ئاسوودەیی شەخسی هەیە)، بڕگەی یەکەمی بەندی شەشەم لە بەڵێنی نێودەوڵەتی تایبەت بەمافی مەدەنی و سیاسی ساڵی ١٩٦٦ ئەوە دەگەیەنێ کە: (مافی ژیان مافێکی وا بەستەی مرۆڤە و دەبێ یاسا ئەم مافە بپارێزێ و ناشێ کەس بەزۆرەملێ لە ژیانی بێ بەش بکرێ). وەک زانراوە

چەندین ساڵان رژێمی عێراق بێ گوێدانە مافی خەڵک و مافی مرۆڤ زۆر بێ ڕەحمانە هەرێمی کوردستانی مین رێژکردووە، زۆر جاران لەسەر رووپەری ڕۆژنامە و گۆڤارەکان نووسین لەسەر ئەم کێشەیە دەبینین، بەڵام تاوەکو ئێستا زۆر بەکەمی دەبینین نووسەرێک یاخود ڕۆشنبیرێک لە ڕۆژنامەکاندا دەستخۆشی لەم ڕێکخراوانە بکەن کە کاری مین هەڵگرتنەوە و پاککردنەوەی مین لە کوردستان دەکەن، بۆ ئەوەی هەر هیچ نەبێت کارەکانیان بەرەو باشتر بچێت و سەرکەوتووانەتر بێت، چونکە وەکو زانراوە زۆربەی زۆری ئەم ڕێکخراوانە کە لە کوردستان کار دەکەن ڕێکخراوی مرۆیی خێرخوازینە، ئەم ڕێکخراوانە لەسەر تەمویل و فەندی خۆیان کاری هەڵگرتنەوەی مین دەکەن. چەندین قوربانیان لە ڕێگای ئەم کێشەیە داوە. لەگەڵ ئەوەش هەردەم نووسەرەکان بەساردییەوە باس لە کارەکانی ئەم ڕێکخراوانە دەکەن، هەڵگرتنەوەی مین کارێکی ئێجگار قورسە زۆر جاران بۆ سەلامەتی مین هەڵگر کارەکە تاخیر تر دەبێت جگە لەمەش ڕژێمی عێراقی لەناوچوو و ئێران زۆر بێ بەزییانە مینیان لە ناوچەکانی کوردستان چاندووە، کە تاوەکو ئێستاش هیچ نەخشەیەکی ئەم کێڵگانە نەکەوتۆتە بەردەستی ڕێکخراوە مین هەڵگرەکان.

تاوەکو ئێستا هیچ کتابێک دەربارەی مین لە کوردستان بڵاونەکراوەتەوە، ئەوەی لەبەر دەستیش

بێت تەنها ئەو بابەتانەیە کە لە ڕۆژنامە و گۆڤارەکان بڵاوکراوەتەوە، وەکو باسم کرد ئەویش زۆربەی زۆریان ڕەخنە گرتنە لە کارەکانی ڕێکخراوەکان، زۆر جاران گوێبیستی ئەوە دەبین ئەرێ کوردستان مینی لێ چێندراوە یاخود کوردستان لەسەر زەوییەکی مینڕێژ دامەزراوە، بەڵێ ئەگەر بەوردی سەرنج لەو ژمارە مینەی ئەو هەرێمە بچووکە بدەین، دەبینین کوردستان لەسەر دەریایەکی مین دامەزراوە، نابێت ئەوە لە یاد بکەین کەوا ڕێکخراوەکانی تایبەت بەکاری مین هەڵگرتنەوە لای خۆیان چەندین نامیلکەیان دەرکردووە، بەڵام ئەو ڕێکخراوانەش تەنها باس لە جۆری مین و ئامۆژگاری و خۆپاراستن لە مین ددکەن. مین کێشەیەکی زۆر گەورەی بۆ میللەتەکەمان دروست کردووە و بۆتە کۆسپ لە ڕێگای ئاوەدانکردنەوەی دێهاتەکانی کوردستان.

لە دیباجەی ڕێککەوتننامەی قەدەغەکردن و بەکارهێنان و ئەمبار کردن و دروستکردن و گواستنەوەی مین لەساڵی ١٩٩٧دا هاتووە، کە؛ دەوڵەتانی لایەن بڕیاری کۆتایی پێهێنانی دەردەسەری ئەو تووشبووانە بدەن لە ئەنجامی مینی دژ بەخەڵک یا هەموو هەفتەیەک بەسەدان کەس دەشێوێنێ و ژمارەیەکی زۆریشیان گیانی لەدەست دەدەن، ئەوانە زۆربەیان بێ گوناه و مەدەنی و بێ چەکن بەتایبەتی منداڵ، هەروەها کۆسپ دەخاتە بەردەم نەشونوماکردنی ئابووری و ئاوەدانی و دەبێتە

ڕێگر لەبەردەم گـەڕانەوەی پەنابەر و دەربەدەران بـۆ نیشتمان و، ئەو مینانە دوای چەندین ساڵ چاندنیان ئەنجامی خراپتریان دەبێ، واتە هەوڵەکان بۆ پرۆسەی پاکسازی مین تەنیا مەسەلەیەکی مرۆڤخوازی نییە، ئامانجی پاراستنی مافێک بێ لە مافەکانی مرۆڤ، ئەویش ژیانە. بەڵکو بەشداری دەکات لە گەشەپێدانی بەرهەمی کشتوکاڵی و بەخێوکردنی مەڕ و ماڵات و بازرگانی، لەبەرئەوەشە هەر وڵاتێک گەر بۆ چەند ڕۆژێکیش شەڕ و ئاڵۆزی بەخۆوە بینیبێ لە زۆر بوارەوە بەدەست گرفت و نالەباری دەناڵێنێ و، تا ماوەیەکی زۆریش ئاسەواری شەڕ و کاولکاری لە وڵاتەکەیدا بەدی دەکرێ. کوردستانی خۆشمان بۆ ماوەیەکی زۆر لەژێر حوکمی زۆرداری ڕژێمی لەناوچووی عێراق بووە، تووشی زۆر هەلومەرجی سیاسی و، شەڕ و ململانێی خوێناوی و ئازار و نەهامەتیی ترسناک بووە، ئەو ڕژێمەی کە بەبێ هیچ بۆنە و هۆکارێک کوردستانی تێک داوە و مینڕێژی کردووە بۆ ئەوەی ئاسەواری کورد و شۆڕشی کوردی لەناو ببات.

ئەمیری حاجی داود

١٢ ئەیلولی ٢٠٠٣

بەغدا

## مێژووی سەرهەڵدانی مین

جەنگ و شەڕ و کردەوەی سەربازی هەموویان کردەوەی وێرانکارین و زۆر کەم یان هەرگیز ڕەچاوی سەلامەتی خەڵکی سڤیل ناکرێ و گوێ بەماڵ و ئاژاڵەکانیشیان نادرێ. بەکارهێنانی مین هەڵەی سوپا و بڕیاربەدەستانی سوپایە. چونکە زۆر ئاسانە ڕاوێژکارێک بەئاسوودەیی لە نووسینگەی خۆی و دوور لە گۆڕەپانی شەڕ پاڵداتەوە و گوێ بەو گوندنشینە هەژارانە نەدات کە دووچاری ئەنجامی کوشندە لە ئەنجامی بڕیارەکانی ئەو دەبنەوە.

مین وەکو چەک زۆر لە مێژە هاتووەتە کایەوە و لەوانەیە عارەبە موسڵمانەکان لە داگیرکردنی وڵاتاندا، بەڵام بەشێوەیەکی جیاواز لەوەی کە ئێستا هەیە، بەکاریان هێنابێ و باس لەوە دەکرێ کە بزماری گەورە و داری تاشراو بەکارهێنراون لەو شەڕانەدا تاوەکو بەو ئەرکە هەڵسن کە ئێستا مین پێی هەڵدەستێ.

هەندێکیش دەڵێن مین پێشتر لە دەریا و زەریاکاندا بەکارهاتووە نەک لە وشکانیدا. بەڵام گومان لەوەدا نییە کە مین دژ بەکەسان پێش مینی دژ بەتانک دروستکراوە.

دەشێ مین بۆ کاریگەرکردنی چەکەکانی تر بەکاربهێنرێ و ڕێ لەپێشڕەویی هێزەکانی دوژمن بگرێ.

وشـــەی مین لە وشـــەی مـینا Minaی لاتینی کـە واتاکـــەی (ڕەگی خـــاور)ە وەرگـــیـــراوە کـە تـایـبـەتە بەگـــەڕان بەدوای کـــانزای نـاو زەوی، ئەندازیارانی سەربازیش ئەم وشەیان وەرگرت و کاتێکدا بەکاریان هێنا کـە زەوییـــان هەڵدەکـــۆڵی بۆ مین. لە کـــاتی ئابڵـــووقـــەدا مـــینی زەمـــینی تەڵەی تەقـــیـــون و پێشینەکان نەتەقینەوە وەکو ئەو بزمارانەی سوپاکان پێش ۲۵۰۰ ساڵ بەکاریان دەهێنان.

یەکێک لەو ئامێرانە Caltrop ( کە چوار نووکی تیـژی هەبوو ) کە بە مـینی ئێـسـتـا دەچێ لە رووی بەکارهێنانی بۆ کاری بەرگری، ئەم ئامێرە چوار بزمار بوو کە بەزۆر لە ئاسن دروستکراون و لە سەنتەرەوە پێکەوە گـرێدراون، بەشـێـوەیەک چۆنی فـڕێ بدەی یەکێک لە بزمارەکان رووی لەسەرەوە دەبێت و سێ بزمـارەکـەی تر دەبنە بنکە (قـاعـدة)، هەرچەندە ئەم کـــالتـــرۆپە لە ســـەدەی ســـێـــیـــەمی پێش زایین بەکارهێنراوە بەڵام هەمان شێوەی لە پێکدادانەکانی ئێستاشدا بەکاردێت، ئەم شێوەیە بۆ ماوەی نزیکەی ۲۵۰۰ ساڵ نەخشەکەی نەگۆڕاوە و دەکرێ بڵێین ئەم چەکە لە هەموو ئامرازێکی سەربازی تەمەنی درێژتر بووە.

لە ســـەدەی (١٤)دا بارود لە کـــاری ســـەربازیدا بەکارهات و کاریگەری لەسەر هەموو پێکدادانەکانی دواتر هەبوو، بە ۱۵۳۰ تاقیکردنەوە لە بەکارهێنانی مین لە سیسیلی و ئیتالیای باشووردا.

ئەم مینانە بە فۆوگاس Fougasses ناسراون و لە بنەڕەتدا تۆپێکی ژێرزەمین بوو بۆ وردکـــردنی بەرد بەپانتاییەکی زۆر بەکار دەهات.

نزیکترین وەسفی مینی زەمینی کە بەپاڵەپەستۆ دەتەقێتەوە و لەلایەن مێژوونووسێکی سەربازی ئەڵمانی کە ناوی ئێچ فریهیرفون فلیمینگ لە ساڵی ١٧٢٦دا وەسف کراوە. فلیمینگ لە کتێبەکەیدا وەسفی مینی فلادەرماین Fladermine (کە واتاکەی مینی فڕۆکە) دەکات و دەڵێ: مادەیەکی قورینی تێدایە کە پڕ کراوە لە ساچمەی شووشە و کانزایی بەقوڕ سواغدراوە و ٠,٩ کیلۆ بارودی تێدایە و لە قووڵاییەکی کەم دەنێژرێ لەو کاتەی یەکێک پێی لێ بنێ یان ئەو وایەرە توند بکاتەوە کە پێوەی بەستراوە دەتەقێتەوە. ئەمەش یەکەمین مینە کە بەهۆی پاڵەپەستۆیەوە دەتەقێتەوە. لەگەڵ ئەمەشدا مین نەبووە ئامرازێکی دیاری شەڕ، پێش هاتنی نیوەی دووەمی سەدەی (١٩).

لە نیوەی دووەمی سەدەی (١٩)دا فۆوگاس دەسکاری کرا تا بتوانی یەکسەر و بەدڵنیاییەوە بتەقێتەوە، کاتێک رووسەکان لە کاتی گەمارۆدانی سیلیستریادا لە ١٨٢٨-١٨٢٩ فۆوگاسی بەکارەبا تەقیویان بەکارهێنا بەڵام وردەکارییە تەکنیکییەکان لەو سەردەمەدا نهێنی بوو.

یەکەم جار ئامێرەکان بەشێوەیەک دروستکرابوون کە لەگەڵ گەیشتن بەئامانجەکە بتەقنەوە و ئەم مینانە

سەرئاو بوون و هێزی دەریایی ویلایەتە یەکگرتووەکان لە ساڵی ١٨٦١دا بەکاری هێناون. لە ساڵی ١٨٦٢ و لە شەڕی ویلیامسبێرگدا باس لە بەکارهێنانیان کراوە، کاتێک تەقەمەنیان سازدا بۆ ئەوەی لەپڕ بەرووی هێڵی پێشەوەی هێزەکانی وڵاتە یەکگرتووەکاندا بتەقنەوە و، بریتین لە بەرمیلێکی پۆڵاین بەرزییەکەی ١٢٢ سەنتیمەترە چوار پێ و پانییەکەی ٩١,٤ سەنتیمەترە سێ پێ و قووڵایی ٢٥ سەنتیمەترە دە ئینج کە ورتکە کانزای تێدایە. بەرمیلەکە لە ئاسن دروستکراوە و سەرقاپەکەی ئاسنە و بەتەشییەکی بەهێزەوە بەستراوە. لە کاتی تەقینەوەدا لایە تەنکەکانی بەرمیلەکە دەتەقنەوە و سەرقاپەکەی کە بەهۆی تەشییەکەوە قایم کراوە یارمەتیی تەقینەوەی ناوەڕۆکی بەرمیلەکە بەشێوەیەکی ئاسۆیی دەدات. هەر بۆیەشە بەکارهێنانی مین بەشێوەیەکی پێشکەوتووانە یەکەم جار دەگەڕێتەوە بۆ شەڕی ویلیامسبیرگدا لە ساڵی ١٨٦٢ لەو شەڕە هێزە فیدرالییەکانی ئەمریکا هەردوو جۆری مینی دەریایی و وشکانیان دروست کرد و بەکارهێنا.

مین لە شەڕی یەکەمی جیهان زۆر پەرەی ساند کاتێک کە سەربازی ئەڵمانی هاوێژەی مەدفەعیان وەکو مینێک بەکارهێنا بۆ ئەوەی هێرشی تانکی فەرەنسی و ئینگلیزی رابگرن، ئەو پێداچوونەوەی کە لە ساڵی ١٩٢٠ روویدا دروستکردنی TNT

بوو، ئەو مـادەیەش وای کـرد یەکـەمین مـینی دژە تانک دروست بکرێت. لە کـاتی شـەڕی دووەمی جـیـهـان ئەو لوولە پانانەی کـە لە سـتـیل دروست کرابوون ۳۰ سم بوون کـە ۱۰ کـغم TNT تێدابوو، ئەم جـۆرە مـینە زۆر بەکـارهات لەو شـەڕە. بەپێی ئاژانسی پاراستنی بەرگری (DIA) کە ۳۱۷ ملیۆن مـینی دژە تانک لە شـەڕی دووەمی جـیـهـانی بەکـارهێنرا، بەپێی ئەو ئامـارەی لای (DIA)یە کـە ۲۲۰ ملیۆن لەلایەن یەکێتی سۆڤیەتی پێشوو بەکار هات، (۸۰) ملیۆن لای ئەڵمانییەکان، ۱۷ ملیۆن لەلایەن ویلایەتە یەکگرتووەکـانی ئەمـریکا. هەرچەندە ئەو مـینە دژە تانکانە یەک خالّی لاوازی گـەورەیان هەیە، ئەوەیش ئەوەیە؛ دوژمـن زۆر بەئاسـانی دەتوانێ ئەو مـینە هەڵبگرێ و دووبارە بۆ خۆی بەکاری بهێنێ، بۆیە ئەو سەربازانەی کە کاری پاککردنەوەی مین دەکەن وایان لێهات بەدرێژای ٢٤ کـاتژمـێـر ژیانیـان لە مـەترسی دابێت و ئاگـەداری خۆیان بن، هەردوو لایەن ئەڵمانییەکان و هاوپەیمانان لە دەوراوپشـتی کـێـڵگەی مـینی دژە تانـک، جـۆرە مینێکیان بڵاوکردەوە کە لە شووشە دروست کرابوو و لەناویا یەک پاوەند یان کەمتر تەقەمەنی تێدابوو.

یەکـەم جـۆرە مـینەکـانی دژە کـەس کـە دروسـتکرا بەپاڵەپەستۆیەکی راستەوخۆ ئینجا دەتەقێتەوە ئەم پاڵەپەستۆیەش دەبێت لە (١٥-٤٠) پاوەند بێت، یاخـود بەڕاکێـشانی وایەر لە قۆناغـەکانی یەکەمی



مینە سەرەتاییەکان



مینە سەرەتاییەکان

جەنگ ئەو مینانە بە رومانات یا بەفیوزی کارەبای
ئامادەکرابوون، پاشان ئەو فیوزانە پەرەیان پێدراو
وای لێهات بەئاسانی بتەقن یاخود پاڵەپەستۆی
لەسەر بێ. پاش ماوەیەکی کەم کە ئەو مینانە
دروست کران وای لێهات وەکو چەکێک بەکار
بهێنرێت نەک هەر بۆ پاراستنی کێڵگەی دژە تانک،
هەردوو جۆرە مین بەکارهێنرا بۆ ئەوەی سەربازەکانی
دوژمن تێکیان بشکێنن و بیان ترسێنن یا بۆ کوشتن
و تۆقاندنی خەڵکی مەدەنی. سەربازانی یابانی
مینیان وەکو لایت و ڕادیۆ لە کاتی شەڕەکاندا
بەکاری دەهێنا.

هەروەها هەندێ جار لەژێر تەرمی کوژراو مینیان
دادەنا هەرچەند ئەو کارە بەرەسمی ئیدانە کرا، بەڵام
ئەم شێوەیەش زۆر بەکارهات. باکووری ئەفریقیا
یەکێک بوو لەو شوێنانەی کە بەرێژەیەکی زۆر مینی
تێدا بەکار هات بۆ ئەوەی کاتی شەڕی ئیتالییەکان
و ئینگلیزەکان پاسەوانێتیی خاڵە گرنگەکانی سەر
سنووری میسر و لیبیا بکات. ئینگلیزەکان توانیان
بەهۆی بەکارهێنانی مینێکی زۆرەوە. هێرشێکی
ئیتالی بشکێنن لە ساڵی ١٩٤٠ کە وایان کرد
هێزە ئیتالییەکان زیانێکی زۆریان پێ بکەوێت و
ببێتە هەڕشەیەک کە هەردەم هێزەکانیان لە مین
بترسێن. ئیتالییەکانیش مینی پەرت و بڵاویان لە
ئاسماندا بەکار دەهێنا دژی ئینگلیزەکان، لە کاتی
شەڕی چوار هەفتەی (غەزالە) لە ساڵی ١٩٤٢

زیاتر لە ٥٠٠ هەزار مینیان بۆ بەرگری لە ناوچەی (تبرق) و (غەزالە) چاند. هێرشی ئەڵمانی بەناو بیاباندا گەیشتە هێڵی (عەلەمەین)، لە مانگی شەشی ساڵی ١٩٤٢ لەو شەڕە دووبارە هەردوو لا بەشێوەیەکی زۆر مینیان بەکارهێنا، (فیلد مارشل ئیتروین روملڵ) سەرکردەی هێزی ئەڵمانی بوو لە ئەفریقیا زۆر متمانەی لەسەر مین دەکرد، بۆ ئەوەی قەرەبووی کەمی چەک و سەربازی لە هێزەکانی خۆی بکاتەوە. ئەو سەرکردەیە مینی ئەڵمانی و فەرەنسی و ئیتاڵی لە شوێنی دیکە هەڵدەگرت و لە ناوچەکانی سەرسنووری هێزەکانی خۆی دادەنا کە نزیکەی ١٠ هەزار مین دەبوون، بۆ ئەوەی هێڵێکی بەرگری بۆ خۆی دروست بکات لە کاتی هێرشی ئینگلیزەکان. لە عەلەمەین کێڵگەی مینی هەردوولا تێکەڵ بەیەکتر بوو، کە وای لێهات بوو بەیەک لە کێڵگە مینە گەورەکانی هەموو جیهان کە تاوەکو ئێستا بینرابێت. بەملیۆنەها ناوچەی مینڕێژکراو پێویستی بەپاککردنەوە هەیە، لە میسر بەرەو پێشچوون و پەرەساندنی تەکنەلۆجیای دروستکردنی مین وای کرد شێوە و دروستکردنی مینی بەرەو پێش بچێت، پاش شەڕی دووەمی جیهان تاوەکو مین لەگەڵ گۆڕانکارییەکانی شەڕ و پەرەساندنی تەکنەلۆجیای سەربازی بگونجێ، لە سەرەتای شەستەکان ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا جۆرە مینێکی نوێیان دروست کرد کە ناسراوە بەمینی

پەرت و بڵاو[*] ئەم مـــینە بەکـــار هات بۆ ئەوەی هێڵی درێژبوونەوە لە نێوان باکور و باشووری ڤێتنام رابگرێت لەنێـــوان لاوس و کـــەمـــبـــۆدیا. فـــڕۆکـــە ئەمـــریکاییـــەکـــان ژمـــارەیەکی ئەوەندە زۆریان لەو مینانە چاند کە لەنێوان خۆیان وەکو گاڵتە ناویان لێ نابوو زبڵ، چونکە وەکو زبڵ فڕێیـان دەدا. ئەم جۆرە مینە لە ئاسـمـان دەهاوێشـترا دەکەوتە سەر زەوی بێ ئەوەی بتەقێ پاشان کە لەسەری رۆیشـترا ئەو مینە بچووکـە کـە کـێشی ۲۰ کگم پێـدەکـرێت قـاچێک پارچە پارچە بکات. سـەربازی ئەمـریکا زۆر جـار خۆی لەناو ئەو کێڵگە مینانە دەبینی کە فڕۆکەکانی خۆی فڕێیان داوە، هەندێ جاریش ئەم کێڵگە مینانە پێش چەند رۆژێک یاخـود پێش چەند کـاتژمـێـرێک دروست کــــراوە، ئەم پارچە زەویـیـــــانە بەزاراوەی ســـەربازی پێـیـــان ناگـوترێ کـێـڵـگەی مین، ئەم جـێگایانە پارچە زەوییـەکـە مـینی تێـدا پەرت و بڵاوبووە، بۆیە سـنووری ئەم زەویـیـــــانە نەدەزانـرا. هێزەکـانی ڤـێتنامی چەند جۆرە مـینێکیـان بەخۆیان دروست دەکـرد و بەکـاریان هێنا، سـەلماندیان کـە ئەوانیش دەتوانن مینی مەترسیـدار دروست بکەن، لە ســالی ۱۹٦٥ بەپێی لێکۆڵینەوەیەک لەنێـوان

(*) مـینی پەرت و بڵاو کـە هێـزەکـانی ئەمـریکا یەکـەم جـار هەڵسان بەدروستکردنی لە دەوروبەری سنووری ڤێتنامیان فڕێ دا، هەر ئەو مینە بووە هۆی بڵاوبوونەوەی کێشەیەکی زۆر بۆ بەرەو پێش چوونی ســـەربازانی ئەمـــریکا لەم ناوچانەدا.

٦٥٪- ٧٠٪ زیانی ماریـنزی ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا هۆیەکەی مین بوو.

شەڕی مین زۆر گرنگ بوو لە شەڕەکانی لایەنی ڕۆژهەلاتی، کاتێک کە سەربازەکانی سۆڤیەتی سیستمێکی مینی بەکار دەهێنا دژی هێرشی ئەڵمانی. مینیان بەکارهێنا بەڕادیۆ و کۆنترۆڵ تاوەکو درەنگ بتەقێتەوە، هەروەها لەگەڵ تۆڕێکی زۆر گەورە لە مینی دژە تانک و دژە کەس لە دەوراوپشتی مۆسکۆ بەکار دەهات. یەکێتی سۆڤیەت نزیکەی ٢٢٢ ملیۆن مینی بەکارهێنا لە شەڕی دووەمی جیهان وای لێهات یەکێتی سۆڤیەت ببێتە گەورەترین بەکارهێنەری مین لە مێژوودا. پەرەساندنی دروستکردنی مین وای کرد کاتی شەڕکان تەکنەلۆجیای پاککردنەوەی مینیش پەرەبسێنێ. مین دۆزەرەوەیان دروست کرد تانکەکان بەزنجیری کانزایی دروست کران بۆ ئەوەی بەرەو پێش بڕوات هەر مینێک هەبێ خاوێنی بکاتەوە.

بەڵام لە مانگی تەموزی ساڵی ١٩٤٣ لە شەڕی (کۆرسک) هێزەکانی یەکێتی سۆڤیەت و ئەڵمانییەکان لە دەریایەکی پڕ مینی خنکان کە پێک هاتبوو لە مینی دژە تانک و دژە کەس کە وای لێهات ٣٠٠٠ هێرشی ئەڵمانییەکان بشکێنن.

لەگەڵ ئەوەی کە هێزەکانی ئەمریکا زۆر مەترسی ئەوەیان نەبوو تووشی مینی ئەڵمانی بن لە باکوری ئەفریقیا، بەڵام تووشی مەترسی راستەقینەی مین



جۆری مینی ساچمەدار (ڤالمارا ٦٩)



جۆری مینی دژە تانک (تی سی٤.٢)

نەبوو تاوەکو ساڵی ١٩٤٤، لە کاتی شەڕی (کازینۆ) لە ئیتالیا مینی ئەڵمان هۆکاری ١٣٪ زیانی ئەمریکاییەکان بوو. لە ڕۆژی هاتنە خوارەوە لە (نورمەندی) لە فەڕەنسا لە ١٩٤٤/٦/٦. هێزەکانی ئەمریکا و هاوپەیمانان تووشی نزیکەی ٦ ملیۆن مینی دژە تانک و دژە کەس بوون کە هێزەکانی (ڕۆمل) چاندبوویان، هەروەها هێزەکانی هاوپەیمانان تووشی کێڵگەی مینی گەورەتر و زۆرتر بوون لە هێڵی (سکفرد) کە هێڵی بەرگری خۆی بوو، کاتی کە هێرشیان برد بۆ ناو جەرگەی ئەڵمانیا. بەگشتی مین هۆکاری ٢٠٪ زیانی تانک و هەروەها ٢,٥٪ کوژراو لە شەڕەکانی (پاسفیک)بوو.

پەیدابوونی شەڕی سارد کاری لە ئەوروپا مین گۆڕا، لە چەکێک کە لە مەیدانی شەڕ بەکاردێت بۆ چەکێکی بەرگری کە لەسەر هەموو ئەو جێگایانە دادەنرا کە جیایی دەکردەوە لەنێوان ڕۆژهەڵات و ڕۆژئاوای ئەوروپا. هەروەها کێڵگەی مین زۆر بەگەورەیی بینرا لە شەڕەکانی ئیقلیمی کە لە ماوەی پەنجا ساڵی ڕابردوو ڕووی دا. لە شەڕی کۆریا شەڕی مین جیاوازیەکی کەمی هەبوو لە لایەنی تەکنەلۆجیا و لە لایەنی هۆکاری لە شەڕی دووەمی جیهان، چونکە سروشتی (نیمچە دوورگەی کۆریا) سروشتی شاخاوییە، ناچار بوون بەو شوێنانەدا بڕۆن کە شوێنی ڕۆیشتنە، وای لێهات هەردوو لایەن



جۆری مینی کلّپەدار (ڤی ئێس ٥٠)

وایان پێ بکرێ، هاتنە پێشی دوژمن خۆی تێک بشکێنێ. ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا سەرچاوەیەکی سەرەکی بوو بۆ کێلگەی مین، لەو شەڕە سەربازەکانی کۆریای باکور توانیان ژمارەیەکی زۆری مینی ئەمریکی بگرن دژی هێزەکانی نەتەوە یەکگرتووەکانی ئەمریکا سەرپەرشتیان دەکرد بەکاری بهێنن کە بەرگریان لە کۆریای باشوور دەکرد.

بەگوێرەی قسەی ڕەسمی، کێلگەی مین هۆکاری ٤٪ زیانەکانی ئەمریکایی بوو لە شەڕی کۆریا، هێزەکانی کۆریای باکور هاوپەیمانە چینییەکانی تووشی زەرەروزیانێکی زۆر کرد چونکە ئەوان تەکتیکی (دەریایەک لە مرۆڤ بوو) ئەو تەکتیکەیان بۆ خاوێن کردنەوەی کێلگەی مین بەکار هێنا ئەوەش بەناردنی سەربازێکی زۆر کە ببنە

قـــوربانی. دوای ئەوەی کـــە لە ســـاڵی ١٩٥٣ ئاگربەست دروست بوو هێزەکانی ئەمریکا و کۆریای باشـوور زۆر کـێـڵگەی مـینیـان بەدرێژایی ناوچەی چەککراو چاند کـە باکـور و باشـووری کۆریا لە یەک جیادەکاتەوە.

کـێـڵگەی مین چەکـێکی سـەرەکی بوو لە کـاتی شـەڕی ڤـێـتنام، هێـزەکـانی (ڤـیت کـۆنگ) هێـزی چەکـداری ڤـێـتنام بوون، ئەوانە مـینیـان لە دژی خەڵکی مـەدەنی و سـەربازی لە شـەڕی خـۆیان دژی باشووری ڤێتنام بەکار دەهێنا کە وای لێهات شەڕی ڤێتنام بەرپابوو، کەچی هێزەکانی باشووری ڤـێتنام مـینیـان بۆ پێـگە سـەربازییـەکـان و گـوندەکـان بەکارهێنا. کاتێک کە هێزەکانی ئەمریکا لە ساڵی ١٩٦٥ بەربڵاوبوون مـینی دژە کـەسـیـان وەکـو چەکـێکی بەرگـری لە دەوراوپشـتی فـرۆکـەخـانە و شـوێنەکـانی دیکە بەکـارهێنا. هەروەها بۆ ئەوەی هێـرشی لەناکـاو رابگرن هەردوو جـۆرە مـینی دژە تانک و دژە کـەسیـان بەکـارهێنا. هەروەکو لە کوریا هێزە ڤێتنامییەکان زۆر گرنگیان دا بەکێڵگەی مین بەتـایبـــەتی مـــینی (کـــلایمۆر)، هەروەها تەقـەمەنییـەکـانی دیکەی ویلایەتە یەکگرتووەکـانی ئەمریکا، بارودۆخی نائاسایی شـەڕی باخەکان وای کرد زۆر زەحمەت بێ نەخشەی کێڵگەی مین دابنرێت بۆ ئەو هۆیانە بوو کە مین زۆر بەکارهێنرا، هێزەکانی ویلایەتە یەکگرتووەکـان تووشـی زیان بوون بەچەکی

خـــۆیان ٣٠٪ لە ٤١٨٤٠ کـــوژراوی ئەمـــریکی هۆیەکەی کێڵگەی مین بوو.

تەنانەت لەو سەرەتاییەشدا بەکارهێنانی مین سۆز و هەستی بەهێزی وروژاند و حوکمی لەسەردرا کە گرنگ نییە بەکارهێنانی لە شەڕدا گونجاو نییە. بەڵام دوای شەڕ ئەو مینانە یان ئەو تۆربیدانە لەو کاتە مینی زەمینی و مینی ئاوی جیاکرانەوە ٢٩ پاپۆڕیان نوقمی دەریا کرد و ١٤ تریان لە کارخست. توانای مینی هەرزان بەها بۆ تێکشکاندنی پاپۆڕی گران بەها کێشمەکێشێکی ئابووریی لێکەوتەوە و بووە هۆی بڵاوبوونەوەی.

ئەمریکاییەکان یەکەمین میللەت بوون کە مینیان پێشخست و بەکارهێنا ئەمەش بۆ عەمید گابرێیل رینز دەگەڕێتەوە. رینز پسپۆڕ بوو لە بۆسەنانەوە لە کاتێکدا سەرکردایەتیی فرقەیەکی سەربازیی لە شەڕ دژی هیندییەکان لە فلۆریدا لە ساڵی ١٨٤٠دا سەرکەوتنی بەدەست نەهێنا، بۆیە لە ساڵی ١٨٢٦ فەرمانی بەفیرقەکەدا بۆمبا ئامادە بکەن لەگەڵ ڕاکێشانی تێلەکان یان لەگەڵ پێ لێنانیان بتەقنەوە. لە ٤ ئاباری ١٨٢٦دا کاتێک پیاوێک بەسواری ئەسپەوە لەسەر رێی بەرەو یۆرکتاون ئەسپەکەی یەکێ لەو مینە زەمینانەی بەرکەوت بەسەریا تەقیەوە، ئەوەش بووە یەکەمین کەس بەهۆی پێ نان لە مین بکوژرێ.

لە زستانی ١٨٦٢-١٨٦٣ رینز کاری بۆ

نەخشـەكێشـان بۆ پێشـینەیەک (كـە بەكـەمـترین پاڵەپەسـتۆ بتەقێـتەوە) دەكـرد و دوای ئەوەی دوو پەنجـەی دەسـتی ڕاسـتی لە دەست دا، بڕیاری دا پاڵەپەستۆی پێویست بۆ تەقینەوەی مینەكەی بكات بە ٣,١ كـیلۆ و بەهاتنی سـاڵی ١٨٦٣ ئەو مـینە بەشێوەیەكی بەرفراوان و سـەركەوتوو لەو ماوەیەدا بەكـارهات. شـەڕی ناوخـۆ ئەوەی ئاشكرا كـرد كـە تەمـەنی مین لەژێر زەوی زۆر درێژترە و لە سـاڵی ١٩٦٠دا پێنج ناوچە دۆزرانەوە كە بەمینی ڕینز مین ڕێژ كرابوون و هێشـتا بەتەواوەتی مـەترسیداربوون نیـشـانیـان بۆ دانرا، سـوپای بەریتـانی لە سـاڵی ١٨٨٠ بەگـوڕ مـینی زەمـینی لە هەڵمـەتەكـانی ئەفریقادا بەكاردەهێنا و لەم شەڕانەدا فـۆگـاسـیـان لەگەڵ مینی پاڵەپەستۆ تەقیویان بەتوندكردنی تێل كە لە ساڵی ١٨٨٤دا دروست كران.

لە شـەڕی یەكـەمی جیـهـاندا ئەڵمـانەكـان مـینی دژەتانكیـان بەكـارهێناوە. لەگـەڵ پێـشـكـەوتنی بەكـارهێنانی تانک و زرێپـۆش لە شـەڕی دووەمی جیهاندا و بۆ بەرەنگاربوونەوەی شەڕی (صاعقة)ی ئەڵمـان، هاوپەیمانەكـان چەندین جـۆر مـینی دژەتانكیـان دروست كـرد و بەچەندین شـێـواز دەیانچاندن.

فەرەنسییەكان و بەریتـانییەكان بەشێودیەكی چڕ و بەربڵاو كـێڵگەی مـینی ئامـادەكراوی پێش شـەڕیان بەكـارهێناوە، بەڕادەیەک ژمـارەی ئەو مـینانەی لە




جۆری مینی دژە تانک (تی ئیم ٤٦)

شەڕی (عەلەمەین)دا چێندران گەیشتە پێنج ملیۆن مین و چڕییەکەی گەیشتە زیاتر لە دوو مین لە یەک یاردەدا و لە ڕووبەرێکدا دەگەیشتە پانتایی هەشت کیلۆمەتر، لە کاتێکدا چڕیی مینی چاندراو لەلایەن سۆڤییەتەوە دەگەیشتە ١- ١,٥ مین لە یەک مەتری چوارگۆشەدا بەڵام لە شەڕی (کورسک)دا گەیشتە ٢-٣ لە یەک مەتردا، ئەمەش بووە هۆی لاوازکردنی توانای تاکتیکی لەلای ئەڵمانەکان.

ڕێژەی تانکە تێکشکاوەکانی هاوپەیمانان بەهۆی مینەوە لە شەڕی دووەمی جیهاندا گەیشتە ٢٠٪ و لە ئیتالیا و ناوچەکانی کردەوەی سەربازی لە ئۆقیانۆسی هێمن کە سروشتی زەوی تانکەکانی ناچار دەکرد کە تەنها ڕێگاوبانی ئاسایی بەکاربهێنن ئەم ڕێژەیە گەیشتە ٢٧٪ و ٣٣٪ی ژمارەی تانکە

تێکشکاوەکان لەو دوو ناوچەیەدا.

لەو هێرشانەش کە دەکرانە سەر مۆڵگە سەربازییە بەرگریکارەکان ٤٠٪ تانکە تێکشکاوەکان بەهۆی مینەوە لەناو دەچوون.

لە شەڕی کۆریاشدا ٧٠٪ زیانی گشتی تانک بەهۆی مینەوە بوو. بەنیسبەت زیانی گیانیشەوە ئەم ڕێژەیە بەگشتی کەمتر بوو، بۆ نموونە لە ناوچەکانی شەڕی دوومی جیهانیدا ڕێژەکە دەگەیشتە ١٪. بەنیسبەت مینی دەریاییشەوە زیانەکانی ناوچەی کردەوەی سەربازی لە ئەوروپا گەیشتە ٢٦٦٥ کەشتی بەهۆی ١٠٠ هەزار مینەوە و لە ئۆقیانۆسی هێمندا ١١٠٠ کەشتی بەهۆی ١٢ هەزار مینەوە نغرۆ بوون.

تەنها لە ساڵی ١٩١٨دا مین بەشێوەیەکی بەرفرەوان دەرکەوت وەکو ڕەتدانەوەیەکی ئەو چەکەی کە تازە دەرکەوتبوو، ئەویش تانکە لەگەڵ زیادبوونی ژمارە تانکە ئەمریکاییەکان، ئەڵمانەکان پێویستیان بەداهێنانی چەکێک هەبوو بۆ بەرەنگاربوونەوەیان، بۆیە سەرەتا پەنایان بردە بەر ناشتنی تۆپ لەژێر زەوی و بەدار دایان دەپۆشی، بەڵام زوو دەرکەوت کە ئەم مینە هەڕەمەکییانە بێ هودەن و لە سەرەتای ساڵی ١٩١٨دا توانرا مینی دژە تانکی چالاک بەکار بێنن.

مینی دژە تانک بریتی بوو لە سندوقێکی دار بەقەبارەی ٤٥,٤ سەنتیمەتر (١٨ ئینج) ٣٥,٥

سەنتیمەتر (١٤ ئینج) ٢٠,٣ سەنتیمەتر (٨ ئینج) کـە لە ٦,٣ لە گـەنکۆتـن (کـە بەهۆی پالّەپەسـتـۆ لەسـەر سـەرقـاپەکەی کە لەسەر پەلەپیـتکەیەک. ئەم مینە بەپالّەپەستۆی ٤٥,٣ کیلۆگرام دەتەقێتەوە واتە ئەگـەر مـرۆڤـیـش پێـی لێ بنێ دەتـەقـێـتـەوە. لە سەرەتای شەڕدا ئەو مینانە کە بەهۆی تۆڕێـک تێلی بەیەکـەوە بەسـتـرا و دەتـەقـینـەوە بەکـارهاتـن، بەڵام لەبەر ئەوەی ئەم شێـوازە مەترسـیـدار بوو بۆ هەردوو لای شەڕکـەر بۆیە قەدەغـە کرا. لە شوێنە چۆڵەکاندا مـینی دە کـەسـان بەکـارهێنرا. بۆ ئەم مـەبەسـتـە دروسـتـکرابوو و ئەم جـۆرە مـینـە پێی دەگـوترا (ئەی بی).

مینی لوولەیی کە لە دینامێت لەسەر شێوەی پیتی T دروستکرابوو:

لوولەیەکی ئاو درێژیی ٦٣,٠ سـەنـتـیـمـەتر، لوولەیەکی شووشەیی لە پارچە بڕەرەکە تەقێنەرەکەی پێوەیە، پارچەیەکی پۆلایین لە بەشە درێژەکەی پیتی T کە سـەرێکی لەسـەر لوولە شـووشـەییـەکـەیە کـە ١,٢٧ سـەنتـیـمـەتری لەسـەر زەوییـە و لەگەڵ پێنان بەسەریا لوولە شووشەکە دەشکێ و دەتەقێتەوە ئەم جـۆرە مـینە وا دروسـتـکراوە کـە خـەڵک پەککەوتە بکات و بیـانـکوژێ. ئەڵمـانەکـان بە دوو جـۆرە مین داخلـی شـەڕی دووەمی جـیـهـان بوون. بەڵام لەگەڵ کـۆتایی هاتنی شـەڕەکـە (١٦) جـۆری مـینی دژە تانکیـان داهێنابوو لەگەڵ (١٠) جۆری دژە کەسـان.

هەروەها چەندین جۆرە تەلەیان بەکارهێنا.

لە ساڵی ١٩٤٠ فرقەیەکی فەرەنسایی دووچاری ئامێرێکی نوێ بووەوە کە قەڵەمبازی هەڵدەدا پێش تەقینەوەی، ئەمە پێی دەگوترا (سەربازی بێ دەنگ). قەبارەکەی بەقەد قووتووەکی پیپسی بوو، بەهۆی ئامێرێکی پاڵنەری لقدار یان بەهۆی تێلەوە چالاک دەبوو و، نزیکەی مەترێک لە زەوی بەرز دەبووەوە پێش ئەوەی بتەقێتەوە و، نزیکەی ٣٥٠ ساچمەی پۆلاییینی لێ دەبووەوە و بۆ دووریی ١٥٠ مەتر بڵاو دەبوونەوە.

لە کۆتایی ساڵی ١٩٤٤دا سەربازانی ئەمریکایی لە ناوچەی لۆرینی فەرەنسا بەناو کێڵگەیەکی میندا تێپەڕین مینەکان لە پلاستیک دروستکرابوون و لە یەک کێڵگەدا ١٢ هەزار مین لەم جۆرە هەبوو، ئەم مینانە بەئامێری ئاشکراکردنی مادەی کانزایی نەدەدۆزرانەوە. لە ساڵی ١٩٤٥دا راپۆرتێکی سوپای ئەمریکا دەرخست کە ٢,٥٪ تا ٢,٧٪ی قوربانیانی جەنگ قوربانیی مین بوون.

## لێکۆڵینەوەی مێژووی بەکارهێنانی مین

### مینی زەمینی و مینی دەریایی و جەنگی فۆکلاند

جەنگی فۆکلاندی نێوان بەریتانیا و ئەرجەنتین کە لە ساڵی ١٩٨٢-١٩٨٣دا دەستی پێکرد، نوێترین تاقیکردنەوەی شەڕی مینی زەمینی و مینی دەریاییە. دوای کۆتایی هاتنی شەڕەکە بەسێ ساڵ، پسپۆڕانی سەربازی بەریتانیا دەستیان کرد بەتوێژینەوە و شیکردنەوەی وانە مەیدانییەکانی ئەو شەڕە، کە هەردوو لایەنی بەشدار (بەریتانیا و ئەرجەنتین) نوێترین و کاریگەرترین چەکی خۆیان تێدا بەکارهێنا.

سەرچاوە بەریتانییەکان وایان ڕاگەیاند کە شەڕی مین بەشێکی دیاری هەبوو لەو توێژینەوە و شیکردنەوانە بەهۆی ڕۆڵی گرنگی مینەوە، چونکە ئەرجەتین نوێترین جۆری مینی لەو شەڕەدا بەکارهێنا.

یەکەکانی ئەندازیاری سەربازیی ئەرجەتین بەباشترین شێوە بەئەرکی خۆیان لە چاندن و هەڵگرتنەوەی میندا هەڵسان و لە سەرەتای شەڕەکەدا سەرکەوتنێکی بەرچاویان بەسەر بەریتانیادا بەدی هێنا، پێش ئەوەی هێزەکانی بەریتانیا شوێنی کێڵگەکانی مینیان بۆ ئاشکرا بێت و ئامێری پێشکەوتووی ئاشکراکردنی مین (كاشفة الغام)یان دەست بکەوێ.

هەمان سەرچاوە ئاماژەی بەوە داوە کە هێزەکانی ئەرجەنتین پێش دەستپێکردنی شەڕەکە چەندین کێڵگەی بەرفراوانی مینیان چاندبوو لە دەورووبەری هێڵەکانی بەرگری و ناوچە ئاوادانەکاندا، هەروەها چەندین ناوچەی کەناری ئاویان مین ڕێژکردبوو کە گومانیان دەکرد هێزە بەریتانییەکان بۆ هاتنە سەر وشکایی بەکاریان دێنن.

هێزە ئەرجەنتینییەکان بۆ چاندنی مین چەندین سیستەمیان بەکار دەهێنا لەوانەش بەکارهێنانی هیلیکۆپتەر و ئۆتۆمبیل، زۆربەی مینە چێنراوەکان دژە تانک و دژ بەکەسان بوون.

لە ڕۆژانی یەکەم ئەم مینانە بوونە ڕێگر لەبەردەم پێشڕەوی هێزەکانی بەریتانیا و زیانی زۆر گەورەیان پێگەیاندن و لە هەندێ شوێندا تا کۆتایی شەڕ هەر ڕێگر بوون لەبەردەم پێشڕەوی بەریتانییەکان.

هەروەها ناوەندە سەربازییە بەریتانییەکان دانیان بەوەدانا کە ئامێرەکانی کەشفی بەریتانی لە ئاستی ئەو تەکنیکە دانەبوون کە لە دروستکردنی مینەکانی ئەرجەتین بەکارهاتبوون.

یەکێ لە گرفتە هەرە گەورەکان کە ڕووبەڕووی یەکەکانی پیادەی بەریتانی بووەوە لە کاتی داگیرکردنەوەی دوورگەکانی فۆکلاندا مەسەلەی خاوێنکردنەوەی ڕووبەرێکی زۆربوو لە مین بێ ئەوەی نەخشەی کێڵگەکانی مینیان لەبەردەست بێ کە هێزەکانی ئەرجەنتین چاندبوویان، چونکە هەموو

کێڵگەکانی مین بچووکی دژە کەسان و گەورەی دژە تانک، نەدەکرا بەئامرازە ئاساییەکانی ئاشکراکردنی مین ئاشکرا بکرێن ئەمەش بووە هۆی کوشتن و برینداربوونی زۆر لەو کەسانەی مینیان لەو کێلگانە هەڵدەگرتەوە، لە کاتێکدا کە هیچ ڕێگەیەکی دیکە نەبوو بۆ ئەنجامدانی ئەم کارە.

ئەو هەڕەشە گەورەیەی کە لە کێڵگە بچووکەکانی دژە کەسانە دروست دەبوو بەهۆی سێ جۆرە مینی سەردکییەوە بوو: ئیتاڵی و ئیسپانی و پەستەکیی و پلاستیکی و جۆرێکی تر کە ئەرجەنتینی بوو، ئاشکراکردنی سانا نەبوو بەبەرگی پلاستیکی بەرگی کرابوو پسپۆرێکی بەریتانی لە ڕاپۆرتێکدا سەبارەت بەم مینانە دەڵێ:

(بەپێی پەیماننامەی جنێڤ بەکارهێنانی ئەم جۆرە مینە کارێکی شەرعییە، چونکە بڕێکی زۆر کەم مادەی کانزایی (معدن) تێدایە، هەرچەندە پەیماننامەکە بڕی کانزایی ناو مینی دیاری نەکردووە تاوەکو بەکارهێنانی شەرعی بێت، بەڵام ئەم بەشە زۆر کەمانە کاری ئاشکراکردنی ئەم جۆرە مینانە زۆر گران دەکات تەنانەت بەئامێری زێدە هەستیاری ئاشکراکردنی مینیش، هەروەها ئەم مینە سپرینگێکی تێدایە. بۆیە تا ئێستا ڕێگەی ڕزگاربوون لەم مینانەش کە لە فۆکلاند چێنراون چەند کارگەیەکی تایبەتمەندی بەریتانی لە کۆششدان بۆ دۆزینەوەی چارەیەک بۆ ئەم گرفتە، ناوچەیەک

ڕووبەرەکەی ٩٠٤٣ هیکتارە لە مین خاوێن کراوەتەوە کە مەیدنی شەڕ بووە.

ئەرجەنتین کە پێشبینی دەکرد بەریتانیا هێزەکانی خۆی لە بەندەری (ستانلی) دابەزێنێ، هەڵسا بەمینرێژکردنی ئەو بەندەرە و دەورووبەرەکەی و نەخشەی بۆ کێڵگەکانی مین لەو ناوچەیەدا کێشابوو و دۆسیەی تایبەتی بۆ تۆمارکردنیان کردبووەوە، ئەمەش کاری هەڵگرتنەوەی مینی ئاسانتر کرد.

تا ئێستا نیوە ڕووبەری بەندەری ستانلی لە مین پاککراوەتەوە، بەڵام تا ئێستا کەنارەکان کاریان تێدا نەکراوە و بەهۆی کەمبوونەوەی ئاستی ئاوی دەریاوە چەندین مینی دەریایی ئاشکرابووە.

هێزەکانی بەریتانیا لە هەندێ حاڵەتدا ڕانە ئاژەڵیان بۆ ئاشکراکردنی ناوچە مینرێژکراوەکان بەکاردەهێنا، هەرچەندە ئەم کارە کارێکی نامرۆڤانەیە لە هەندێ ڕووەوە، بەڵام گیانی چەندین ئادەمیزادە لە مەترسی مین ڕزگار کردووە.

بەریتانییەکان چەندین کەشتییان بۆ دۆزینەوەی مینە دەریاییەکان بەکارهێناوە، بەڵام تاکو ئێستا تەنها پێنج مینیان دۆزیوەتەوە و یەکێکیان نێردراوەتەوە بەریتانیا بۆ پشکنینی، وادیارە چەندین مینی جۆراوجۆر هەن کە پێویستە کار بۆ دۆزینەوە و لەناوبردنیان بکرێت.

## شەڕی دووەمی جیهان ١٩٣٩- ١٩٤٥

لە باکوری ئەفریقیا کێڵگە مینی گەورە چاندرا بۆ ئەوەی ببێتە بەربەستێک، بۆ ئەوەێ هاتنە ژوورەوەی دوژمن رابگرێت جێگایەکانیش دیار نیینە چونکە نیشانەکان هەمووی ون بووینە یاخود لەسەر نەخشە دیار نینە.

لە ئەوروپا لە کۆتایی شەڕ کێڵگەی مین زۆر بەبەربڵاوی بەکارهێنرا، لە میسر و لیبیاش بۆ قەرەبووی نەبوونی شوێنێکی بەربەست، بەشێوەیەکی زۆر بەربڵاو مین بەکارهات، هەر ئەم مینانە بۆ ماوەیەکی زۆر دوای ئەم شەڕە وەکو هەڕەشەیەکی بەردەوام بوو بۆ خەڵک کە چەندان قوربانیی هەبوو.

## پلانەکانی نەتەوە یەکگرتووەکان لە کۆریا ١٩٥١-١٩٥٣

نزیکەی ١٠ وڵاتی جیاواز کە ویلایەتە یەکگرتووەکان و کەنەدا و ئینگلترا و ئوسترالیا و نیوزلندا و تورکیا و چین و باکور و باشووری کوریا دەگرتەوە. ئەوانە هەموو متمانەیان کرد لەسەر مینی دژە کەس وەکو چەکێکی بەرگری، هۆکاری سەرەکیش ژمارەی زۆری هێزی پیادەی چین و کوریای باکوور بوو.

## ئەندەنوسیا و ڤێتنام ١٩٥٨- ١٩٦٨

هەمــوو گــوندەکــان لەم ناوچانە بەهۆی مــینەوە مــینڕێژکــرا ئایا بەدەست چاندرابێ یاخــود لە ئاسمانەوە فڕێ درابێت(*).

نەخشە دروست نەکرا بۆ ئەو کێڵگە مینانەی کە بەدەست دروست کـــرا، چونکە زۆر بەبەربڵاوی مینەکان چاندران. بەشێوەیەکی گشتی ئەو مینانە کە بەدەست چێندران لەلایەن هێزە فەرەنسییەکان چێندران بەڵام لەپاشان لە ئاسمانەوە فڕێدران لەلایەن هێزی ئاسمانی ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا.

## شەڕی هیند و پاکستان ١٩٤٧- ١٩٤٨، ١٩٦٥، ١٩٧١

لەناو ئەو شــەڕانە کــێــڵگەی مین زۆر بەباشی نەخشەی بۆ دروستکرا و نیشانەی بۆ دانرا کە هیچ مینێکی ترسناک بەبێ نەخشە بەجێ نەما، ئەمەش دەگەڕێتەوە بۆ سروشتی شەڕەکە کە ماوەی کورت بوو جێگیریش بوو. ئەو کەسانەی کە کێڵگەی مینیان داناوە زۆر شارەزا بوون.

---

(*) دروستکردنی نەخشەی مین، بۆ ئەو کێڵگانەی کە مینیان لە ئاسمانەوە بەهۆی فڕۆکەوە فڕێ دەدرا زۆر زەحمەتە، چونکە شوێنەکانیان ونن و دیاری کردنی نەخشەش بۆ ئەم شوێنانە زۆر زەحمەتە.

**شەڕی هیند و چین ١٩٦٢**

لەم شەڕەدا کێڵگەی مین تەنها لە ناوچە شاخاوییەکاندا چێندرا ئەمەش هەوڵێکی بێ هودە بوو، چونکە هەموو مینەکان بە بەفر داپۆشرابوون ئەوە بووە هۆی ئەوەی مینەکان نەتەقن.

**رۆدیسیا زیمبابۆی ١٩٦٣، ١٩٧٤- ١٩٨٠**

لە کاتی شەڕی ناوخۆ نزیکەی ١.٥ مین بەشێوەیەکی هەڕەمەکی چێندرا مینە کۆنەکان لەلایەن حکوومەتی نیشتمانی باکوری رۆدیسیاوە بوو دەیویست بیگرێت کە ئێستا پێی دەوترێت زامبیا. هەروەها مینیش وەکو بەربەستێک دژی هێرشبەران لەکاتی شەڕی رزگاری بەکارهێنرا.

**باشووری ئەفریقیا ١٩٦٠-١٩٦٤**

هێزەکانی بەرگری باشووری ئەفریقیا SADF مینی دژە مرۆڤیان لە دەوراو پشتی کەمپە سەربازییەکانی خۆی بەکارهێنا، هەروەها مینیش لەنێوان هێزەکانی باشووری ئەفریقیا و هێزە چەکدارە بەرهەڵستکارەکان لە وڵاتە دراوسێکان بەکارهێنرا، هەروەها بەدرێژایی زۆرانبازی دژی توخمەگەری رەش پێست بێت هەروەها بۆ سەربەخۆیی نامیبیا. هێزەکانی ئۆپۆسوزبۆنیش کێڵگەی مینی خۆیان چاند بۆ ئەوەی ئازار بەهێزەکانی SADF بگەیەن.

## فلیپین ١٩٤٥- تاوەکو ئێستا

هێزە چەکدارەکانی فلیپین AFP بەردەوام لەگەڵ پارتە جیاجیاکانی وڵاتەکە بەشەڕ دێن، لە دوای کۆتایی هاتنی شەڕی دووەمی جیهان AFP تووشی چەند شەڕێکی ناوخۆی بوونەوە دژی کۆمەڵەیەکی جیاوازی لە شیوعی و ئیسلامی. هەرچەندە ئەو گروپانەش مینی دژە کەسیان بەکارهێنا، بەڵام حکوومەتی فلیپینی وا رەچاو دەکا ئەو کێڵگە مینانەی کە هێزەکانی خۆی چاندیان هەموویان تەقێندراون.

## شەڕەکانی عەرەب و ئیسرائیل ١٩٦٧، ١٩٧٣

سەربازە ئیسرائیلییەکان و میسر وسوریا کێڵگەی مینیان بەدرێژای سنووری خۆیان چاند زۆر لەو مینانەش لە بیابانی سینا لەلایەن هەردوو لایەن چێندرا هەرچەندە لەشکری ئیسرائیلی بەبەرچاو نەخشەکانی کێڵگەی مینیان هەموو پێشکەش کرد(١).

---

(١) هەرچەند هێزەکانی ئیسرائیل نەخشەی هەموو ئەو مینانەی کە لە بیابانەکانی میسر و سوریای چاند دا بەم دوو وڵاتە، کەچی تاوەکو ئێستا مینێکی زۆر لەم وڵاتانە هەیە بەتایبەتی لە میسر کە تا ئێستاش زۆر ڕووداوی تەقینەوەی مین لە بیابانەکانیدا ڕوودەدا.

### ئەنگۆلا ١٩٧٥- تاوەكو ئێستا

ئەو مینانە كە چێندران هەوڵێكی كەمیان بۆ سەرف كرا تاوەكو لە نەخشە دابنرێن، سوپای كوبی، سوپای ئەنگۆلی، سوپای باشووری ئەفریقیا هەروەها (UNITA)[١] ئەوانە هەموویان مینیان چاند، هەردوو جۆرە مین بەسەربەخۆیی بەكارهێنرا، ئەو رێگایانەی كە بۆ جەرگەی وڵات دەرۆیشتن هەموو بەسەختی مینرێژ كران، ئەنگۆلا تاوەكو ئێستا بەیەكێك لەم وڵاتانە دەژمێردرێت كە بەسەختی مینرێژ كراوە.

### مۆزەمبیق ١٩٧٦- ١٩٩٣

رێكخراوی جیاواز مینیان چاند، ئەو كێڵگە مینانەش كە نەخشەی بۆ دروستكراوە هەموویان درایە نەتەوە یەكگرتووەكان، هەرچەندە هەموویان نەخشەیان بۆ نەكراوە لە سەرەتا سوپای پورتگالی مینیان چاند پاشان (FRLIMO) و (RENAMO) هێزی لێكدابڕاوەكان و هێزی باشووری ئەفریقیا هەروەها سوپای رودیسیا و هێزی تایبەت، بەڵام سوپای نیشتمانی زیمبابوی (ZNA) مینیان لەم شەڕە بەكارهێنا كەچی پێشتر مینیان دژی رۆدیسیا بەكارهێنا.

---

(١) UNITA: بزووتنەوەیەكی چەكداری دژی دەسەڵاتی حكومەتی ئەنگۆلا بوون كە بەردەوام مینیان دەچاند لە كاتی كێشەكانیان لەگەڵ حكومەت.

### کەمبۆدیا ١٩٧٨، تاوەکو ئێستا

هیچ کێڵگە مینێک لە کەمبۆدیا نیشانەی مینی بۆ دانەنراوە، بۆیە هیچ کێڵگە مینێک نەخشەی نییە بۆ ئەوەی خاوێن بکرێتەوە. بەکارهێنانی مین دژی ژیان و سامانی خەڵکی مەدەنی بە تەکنیکێکی رێکوپێک لەلایەن. هێزەکانی خەمیر ئەلحەمەر کە نەیانهێشت تیمەکانی نەتەوە یەکگرتووەکان و حکوومەتی کەمبۆدیا ئەو جێگایانە رووپێو بکەن، تاوەکو بزانن تا چ رادەیەک ئەو زەوییانە مین رێژ کراون بۆ ئەوەی کۆنترۆڵی بکەن.

### ئەفغانستان ١٩٧٩ تاوەکو ئێستا

هێزی یەکێتی سۆڤیەت و سوپای ئەفغانی و زۆر لە پارتە مجاهیدەکان (پارتە ئیسلامییە سیاسییەکان) مینیان بەکارهێنا بەو مینانەشەوە کە لە ئاسمانەوە فرێ دەدرانە سەر گوندەکان، تاوەکو وای لێهات ئەفغانستان شان بەشانی کەمبۆدیا و ئەنگۆلا بووە یەک لەو سێ وڵاتانەی بەسەختی مینرێژ کرایە لە جیهان و زیاتر لە ٣٠ جۆرە مین چێندرا کە لەلایەن شەش وڵاتی جیاواز دروست دەکرا، خەڵکی ئەم ناوچەیەش تاوەکو ئێستا لە دەست کێشەی مین دەناڵێنن، بەڵام بەم دواییانە پاش رووخانی رژێمی تاڵیبان، چەندین رێکخراوی خێرخوازی بۆ پاککردنەوەی مین و پاشماوەی تەقەمەنی روویان لەم وڵاتە کردووە، کێڵگەیەکی

زۆریان لە مین پاککردوەتەوە و نیشانەی مینیان لە زۆربەشیان چەقاندووە.

### ئێران و عێراق ١٩٨٠- ١٩٨٨

زۆربەی ئەو کێڵگە مینانەی کە چێندراون لە کوردستان بوو کە گۆڕەپانێکی گەورەی شەڕ بوو بۆ ئەو هێرشانەی سوپای ئێرانی دەیکردە سەر سوپای عێراقی، زۆر لەو مینانەی بەکارهێنرا نەخشەی بۆ دروست کرا، هەروەها پاکیش نەکرایەوە، ئەو مینانەش کە لە شەڕی عێراق و ئێران لە کوردستان مایەوە پاشتریش لەلایەن حکومەتی عێراقی زیادکرا، ئەم کارەش وەکو کارێکی مەبەستدار بوو بۆ ئەوەی ئەزیەتی خەڵکی مەدەنی بدات.



پاشماوەی مین لە جەنگی کوێت

**سلفادۆر ١٩٨٠- ١٩٩١**

ئەو مینانەی لە ناوەخۆ دروست دەکران بەزۆری لەلایەن هێزی (FMLN) بەکار هات بەبێ ئەوەی هیچ نیشانەی مین و نەخشەی بۆ دابنرێت. هەرچەندە پاش شەڕەکان (FMLN)[1] هاوکاریی لەگەڵ حکومەت و نەتەوە یەکگرتووەکاندا کرد بۆ ئەوەی ئەو کێڵگە مینانە پاک بکەنەوە.

**سۆماڵ ١٩٨٥- ١٩٩١**

کێڵگە مینە سەرەکییەکان لەلایەن هێزەکانی سەرکردەیەکی سەر بە (سیاد بەری)یەوە چاندرابوون. بەڵام نەخشەکان بە کەڵکی ئەوە نەدەهاتن کەوا ئەم کێڵگانە خاوێن بکرێنەوە، بۆیە کێڵگە مینەکان بەبێ ئەوەی هیچ نیشانەیەکیان بۆ دابنرێت وەک خۆیان بەجێ هێڵران. لە سۆماڵدا مین زۆر بەچڕی بۆ ئەزیەتدانی خەڵکی مەدەنی بەکارهێنرا، ئەویش لە شەڕی ناوەخۆی نێوان حزبەکاندا و، لەلایەن ئەو حزبانەوە بەکارهات.

**لیبیریا ١٩٨٩- تاوەکو ئێستا**

ژمارەیەکی کەمی مینی دژە تانک لەلایەن (NPFL) چێندرا دژی هەردوو هێزەکانی حکومەت

---

(١) (FMLN) هێزی بەرهەڵستکاری سلفادۆر بوون بەرێژەیەکی زۆر مینیان لەم وڵاتە چاند بۆ ئەوەی بەرنگاری سوپای حکومەت بکەن.

و هێزەکانی پاراستنی ئاشتی (Ecomg)، ئەگەرێک هەیە کە کێڵگە مینەکان گەورەتر بوونە لە کاتی شەڕی ناوەخۆ لە لیبیریا، هیچ نەخشەیەک یاخود نیشانەیەک نییە لەسەر کێڵگە مینەکان بۆ ئەوەی لە ئاوەدانکردنەوەی لەلایەن نەتەوە یەکگرتووەکانەوە بزانرێت کە کێڵگەی مینە و بۆ ئەم مەبەستەش لە ساڵی ١٩٩٣ هاتن.

**رواندا ١٩٨٩- تاوەکو ئێستا**

لە جینۆسایدی (کوشتن و قەتل و عام) نێوان مانگی نیسان و حوزەیرانی ساڵی ١٩٩٤ هەروەها شەڕانگێزی هێزەکانی حکومەت کێڵگەی مین پەیدا بوو، مینی دژە تانک و دژە کەس چێندرا دژی بەرەی نیشتمانی رواندی چەند کێڵگەیەک لەم کێڵگانە نەخشەی بۆ دروست کرابوو پێشکەش بەنەتەوە یەکگرتووەکان کرا، بەڵام نەخشەکان تەواو نەبوون لە کاتی کشانەوەی هێزەکانی (هوتو)(١)

بۆ زائیر بەشێوەیەکی هەرەمەکی مینی دژە کەس لە هێڵەکانی شەڕ چێندرا ئەم کێڵگە مینانەش نەخشە و نیشانەی بۆ دانرا.

---

(١) هوتو تیرەیەکن لە وڵاتی ڕواندا دەژین، کە بەتیرەیەکی بەرهەڵستکاری ئازا ناویان دەرکردووە لەم وڵاتە.



جۆری مینی دژەکەس (پەپوولە - PFM-1)

**کرواتیا ١٩٩١- ١٩٩٥**

کاتی شەڕی نێوان کرواتیا و یەکێتی فیدرالی یوگسلافی و هەروەها هێزەکانی کرواتیا و بۆسنە سربەکان. زۆر مینی دژە تانک لە کرواتیا بەدرێژایی سنووری لەگەڵ یوگسلافیا و سربیا چێندرا کە بۆسنا و هرزەگۆفینیا دەگرێتەوە، زۆربەی لەم کێڵگە مینانە وا دەزانرێت کە هێڵی پێشەوە بن بەڵام چەند کێڵگەی مینی جیا جیا لە دەرەوەی ئەم شوێنە بیندرایە. هیچ نیشانەی گرنگ لەسەر ئەم کێڵگە مینانە دانەنراوە بەڵام هەوڵ دراوە پاک بکرێتەوە.

**جەنگی کەنداو ١٩٩١**

هێزی بەرگری عێراقی دوای ئەوەی کوێتیان گرت نزیکەی ٩ ملیۆن مینیان چاند نەخشەیەکی ورد بۆ کێڵگەی مینە عێراقییەکان لەلایەن هێزی هاوپەیمانان دروست کرا و پێشکەش بەحکوومەتی

کوێتی کرا، لە ئەنجامی شەڕی کەنداو حکومەتی کوێتی ٧٠٠ ملیۆن دولاری سەرف کرد بۆ پاککردنەوەی مین، زیاتریش لە ٨ مین هەڵگر مرد لەو پرۆسەیەدا. لە کوێت زۆربەی کێڵگە مینەکان بەدەست چێندران، هەروەها سیستەمێکی دیاریکراو هەبوو چونکە سوپای عێراق دایینابوو، بەڵام بەماوەیەکی کەم توانرا ئەم کێشەیە لەم وڵاتە نەمێنێ.

## بۆسنە و هرزەگۆفینیا ١٩٩٢- ١٩٩٥

ساڵانی شەڕ لە بۆسنە هرزەگۆفینیا خاکەکەی پڕکرا لە مین، وا مەزەندە دەکرێت لە ٣-٦ ملیۆن مین بەجێ ماوە بەبێ خاوێن کردنەوە کە چەند کێڵگە مینی زەحمەتی تێدایە. هەموو لایەنی شەڕ ئەو مینانەیان چاند، زۆربەشیان لەلایەن یوگسلافیای پێشوو دروست کرا بوو وە زۆربەیان بەپلاستیک دروست کرا بوون، کەمێک لەو کێڵگە مینانە نەخشەی بۆ دروست کرا.

## ساڵانی شەڕ لە بۆسنە هرزەگۆفینیا

لە کێڵگە مینەکانی بۆسنی بەسەختی مین بەکارهێنرا، کاتی هێرشی سربی بۆ دەوروبەری شاری (برکۆ) سربییەکان ڕێگایەکیان دانا، کە نێوان سربیا هەروەها ئەو جێگایانەی سرب کۆنترۆڵیان کردووە لە نێوان بۆسنە و کرواتیا، ئەو ناوچانەش بەسەختی مینڕێژکرا.

## شەڕی ئەمریکا لە ئەفغانستان ٢٠٠١

لەم شەڕەش کە ئەمریکاییەکان دژی تیرۆر کردیان هێزەکانی تاڵیبان مینێکی زۆریان چاند، بەڵام هێزەکانی ئەمریکا زوو کۆنترۆڵی ئەم مینانەیان کرد و بووە هۆی ئەوەی کەوا قوربانی سوپای هاوپەیمانان بەهۆی مینەوە لەم ناوچانە زۆر کەم بێت.

## شەڕی ئازادی عێراق ٢٠٠٣

لە مانگی نیسانی ساڵی ٢٠٠٣ هێزەکانی رژێمی عێراق لە کاتی پاشەکشەکردنیان لە زۆربەی ناوچەکانی کوردستاندا، مینێکی زۆریان چاند بۆ ئەوەی ئەو مینانە هەڕەشە لە دانیشتوانی ناوچەکە بکەن. زۆربەی ناوچەکانیش کە مینڕێژ کرا ناوچەکانی هێڵی تەماسی شەڕ بوو، کە هەموو ناوچەکانی کوردستانی لەخۆی گرتبووەوە ئەو مینانەی کە چاندیشی زۆربەیان مینی دژە تانک و مینی ڤاڵمارای کە مینێکی زۆر خەتەرناکە بۆ مرۆڤ هەروەها مینی PMN کە مینی دژە کەسن و زۆر مەترسیدارن.



جۆری مینی ساچمەدار (نیّم ١٨)



جۆری مینی دژە تانک (TM-57)

## مین چییه؟

**پێناسەی مین:**

مین Mine: تەقەمەنییەکە بەرگێکی دەرەکی هەیە لە کانزا یان دار یان پلاستیک دروستکراوە و ئامێرێکی ئاگرکەرەوەی تێدایە، بەشێوەیەک دروستکراوە تاوەکو تانک و ئۆتۆمبیل و بەلەم و کەشتی و فڕۆکە تێکشکێنێ، هەروەها مرۆڤ بکوژێ و بریندار بکات یان پەکی بخات. لەوانەیە بەکاریگەریی دەرەکی بتەقێ وەکو ئەوە مرۆڤ یان هەر ئامێرێک یان ئاژەڵێک بەسەریدا بڕوات یاخود لە دوورەوە بەهۆی ئامێری تایبەتەوە یان لە کاتێکی دیاریکراودا دەتەقێتەوە.

یاخود: تفاقێکە جۆرە تەقەمەنییەکە لەژێر یا لەسەر یا لە نزیک زەوی دادەنرێت بۆ ئەوە دروست کراوە کە بتەقێتەوە بەبوونی یا نزیک بوونی یاخود بەیەکگەیشتنی کەسێک یا ئۆتومبیلێک فتیلەکەی یا وایەرەکەی بەدەست لێدان یا بەئامێرێکی هەستیار دەتەقێتەوە.

مین بەهۆی بەفر و بارانەوە پووچەڵ نابێتەوە و بەژەنگ گرتنیش مەترسییەکانی زیاتر دەبێت.

مین: مادەیەکی تەقینەوەیە یاخود مادەیەکی دیکەیە بەردەوام لەناو پاکەتێکە، ئامانجی تێکدانی ئۆتۆمبیل و فڕۆکە و کەشتییە یاخود زیانی پێ بگەنێت، یاخود بریندارکردن و کوشتنی چەند

کەسێک، دەشکرێ مین بەهۆی مرۆڤ یاخود ئۆتۆمبیل بتەقێتەوە ئەودش بەهۆی دەستلێدان یاخود کەوتنە سەری. زۆربەی مینەکان کە دادەنرێنەوە دەخرێنە ژێر زەوی بۆ ئەوەی خەڵک نەیبینێت. ئەویش بەقووڵایی ١٥ سەنتیمەتر یاخود لەسەر زەوی دادەنرێت. ئێستا نزیکەی ٦٠٠ جۆرە مین هەیە لە جیهان ئەو ژمارەیەش دابەشی سەر هەردوو جۆری دژی کەس و دژی تانک.

یاخود: مین جۆرە چەکێکی زیان بەخشە، بەتەقینەوەی مرۆڤ یان ئاژەڵ دەکوژێت، یان کەمئەندامی دەکات، ئۆتۆمبیل و تانک تێک دەشکێنێت. ئەمەش چەند پێناسەیەکی مینە.

مینی دژە کەسان Anti Personnel Mine : جۆرە مینێکە کە بۆ کوشتنی یان پەکخستنی مرۆڤ دروستکراوە.

مینی دژە تانک Antitank Mine: ئەو جۆرە مینەیە کە بۆ پەکخستن و تێکشکاندنی تانک و ئۆتۆمبیل دروستکراوە.

مینی دەریایی: جۆرێکە لە مین بۆ پەکخستن و تێکشکاندنی کەشتی و پارچەی دەریایی بەکاردێت.

مینی لاسایی کەرەوە Imitation Mine: جۆرێکە کتومت بەمینی ئاسایی دەچێ و هەمان کێشی هەیە بەڵام تەقەمەنیی ومادەی گڕگرتەی تێدا نییە و بەهەمان شێوەی مینی ئاسایی بەکار دێت. ئەم مینە بۆ مەشق کردن لەسەر چاندنی مین بەهەردوو شێوەی



جۆری مینی دژە کەس



جۆری مینی دژە تانک

دەستی و بەئامێر بەکار دێت.

مینی پووچەڵ: Inert Mine: وێنەیەکی نەبزێوە لە مینی ئاسایی بەڵام ئامێری وەگەڕخستنی تێدا نییە. بۆ کاری فێرکاری و فێرکردنی مین لە هۆڵی مین لە هۆڵی وانە وتنەوەدا بەکار دێت.

مینی مەشقی Mine Practice: وێنەیەکی کتومتی مینی ئاساییە، ئامێر و وەگەڕخستنەوەی تێدایە و بەشێوەیەک دروستکراوە کە لەجیاتی تەقینەوە دوکەڵێک دەهاوێ و دەنگێک دەردەکا وەکو دەنگی تەقینەوەی مین بۆ مەشق بەکاردێت تاکو ژمارەی قوربانیانی پێ بزانرێت.

مینی سوارکراو (مسلح) Armed Mine: ئەو مینەیە کە ئامادەیە بۆ تەقینەوە.

سوارکردن (التسليح) Arming: کرداری ئامادەکردنی مینە بۆ تەقاندنەوە بەهۆی دانانی ئامرازی وەگەڕخستن یان لادانی ئامرازی تەئمین کردن یان بەئەنجامدانی ئەم دوو کارە بەیەکەوە.

مینی (صوری) Mineohouy: تەنێکە بۆ نواندنی مین لە کێڵگەیەکی مینی رەمزیدا بەکاردێت و دەشێ لە هەر مادەیەکی کانزایی بەردەست دروست بکرێ.

هێشووە مین Cluster Mine: بریتییە لە مینێکی دژە زرێپۆش کە پارێزراوە بەژمارەیەک مینی دژە کەسان.

مینی رووتکراوە: ئەو مینەیە کە دەرزیی لەسەر نییە.

مینی سوارنەکراو: ئەو مینەیە کە ئامرازی تەئمینی تێدا نییە.

ڕێزە مین Mine Row: بریتییە لە یەک ڕێز لە هێشووە مین کە بە یەک هێڵی ڕاست چێنراون.

کەرتە مین Mine Strip: بریتییە لە دوو هێڵی تەریبی بەیەکەوە دەچێنرێن و ماوەی نێوان دوو هێڵەکە تەنها شەش هەنگاو دەبێت.

کێڵگەی مین Mine Field : بریتییە لە ڕووبەرێکی زەوی ژمارەیەک مینی بەشێوەیەکی دیاریکراو یان نادیار تێدا چێندراوە.

کێڵگەی مین:

کێڵگەی مین بەپێی پێناسەی (WHO) ڕێکخراوی تەندروستی جیهانی: کێڵگەی مین ئەو پارچە زەوییەیە کە یەک مین یان ۲ مین یا ۱۰۰ مین یا ۱۰۰۰ مین یاخود زیاتری تێدابێت، بۆ مەبەستی سەربازی یان ستراتیجی شوێنەکە، تەنانەت هەر جێگایەکیش کە گومانی ئەوەی لێ بکرێت کە مینی تێدایە.

## پێکهاتەی مین

مین لەچی پێک دێت:

مین لە پێنج بەش پێک دێت: تەقێنەرەوە (فیوز) FUSE و مادەی تەقینەوە BOOSTER CHARGE و مادەی سەرەکی تەقینەوە MINE CHARGE قەپێلک (العبوة) CASE جگە لەمانە هەستیار یان ئامرازی بەکرێدان تەلی سەر سمک پێکەوتوو TRIPWIRE لەخۆ دەگرێ.

### جۆرەکانی مین

چەند جۆرە مینمان هەیە بەڵام دوو جۆرە ئاستمان هەیە لە جۆری کێڵگەی مین، مینی گەورەی دژە تانک دروست کراوە بتەقێتەوە بە ئۆتۆمبیل و تانک، هەروەها مینی بچووکمان هەیە کە پێی دەڵێن مینی دژە کەس کە بەتایبەتی دروست کراوە بۆ تێکدانی لەش یاخود کوشتنی مرۆڤ.

مینی دژە تانکەکان ۲-۹ کیلۆگرام تەقەمەنی لە ناویەتی دەتەقێتەوە بەپاڵەپەستۆی ۱۰۰-۳۰۰ کیلۆگرام. وا بەخەڵکی گوترایە کە مینی دژە تانک مەترسی کەمە لەسەر خەڵکی مەدەنی زیاتر لە مینی دژە کەسەکان چونکە مینی دژە تانک بەخەڵکی ناتەقێتەوە. بەڵام هەندێ جار مینی دژە تانک وا دروست دەکرێت بەپاڵەپەستۆی ۷ کیلۆگرام بتەقێتەوە ئەو جۆرە گۆڕینەش بۆ مینی دژە تانک



جۆری مینی ساچمەدار (پرۆم ١)

قوربانییەکەی یەکسەر دەکوژێت. مینی دژە کەس بچووکترە ١٠-٢٥٠ گرام تەقەمەنی تێدایە بەپاڵەپەستۆی ٥,٠-٥٠ کیلۆگرام دەتەقێتەوە.

**مینی دژە کەسەکان**

بەکارهێنانێکی ناڕاستە لە تەکنەلۆجیا، ئەگەر مینی دژە کەسەکان جیاوازی پێ بکەن لەگەڵ چەکەکانی تر، مینە دژە کەسەکان سادەترە تەکنەلۆجیای کەم تێدایە لەگەڵ ئەوەش هەرزانترە.

مین سادە و سانایە چونکە دەتوانی لە هەموو شوێنێک دروستی بکەین هەتا لە شوێنی دانیشتن و گەراجیش. مین وا دروست کرایە کە لەشی مرۆڤ بشێوێنێت و بریندار بکات، دەتوانین مینی دژە کەسەکان بکەینە دوو بەش ئەوانیش مینی ساچمەدار و کلپەدار.

### مینی کلّپەدار

ئەو مـینانەیە لەسـەر زەوی یاخـود لەژێر زەوی دادەنرێت بەپاڵەپەستۆ دەتەقێتەوە، متمانەی سەرەکیان لەسەر کلّپەیانە کە ئازار بدەنە دوژمنی، هەروەها لەوانەیە برێک ساچمەی هەبێ وا بکات بریندار بوون پەیدا ببێ، چونکە واباوە مینەکە دادەپۆشرێت بەپیسایی یا بەبەردی ورد کاتێ کە دەتەقێتەوە بەدەموچاوی بەرکەوتەکە دەکەوێت.

زۆربەی ئەو مـینانەی تازە دروسـتکراون قەپێلکەکەیان بەمادەیەکی پلاستیکی دژی ئاو دروست دەکرێت فتیلەکە و سپرینگەکان بەئاسن دروست دەکرێت وا دەکات ئەو مینە زۆر بەزەحمەتی دیار بکەوێت کە بزانیت شوێنی لە کوێیە.

### مینی ساچمەدار

کاتێ کە مینی ساچمەدار دەتەقێتەوە ساچمەیەکی زۆری لێ دەردەچێت بەرووبەری ١٠-٥٠م دوورایی هەیە ساچمەکانیشی خێراییان دووجاری خێرایی گوللەیە. ئەم تەقینەوەیەش برینی قووڵ و مردن دروست دەکات، مینی ساچمەدار دەتوانین بۆ سێ جۆر دابەش بکەین:

مـینی راوەسـتاو (چەقێندراو): بۆ ئەوەی کاریگەری ساچمە زیاد بێت ئەو مینانە لەسەر ئەو پارچە ئاسنانە دادەنرێت تاوەکو لەسەر زەوی بتەقێتەوە.

مینی ساچمەداری ئاراستەکراو: ئەو مینانەش ساچمەی بچووکی هەیە بۆ لایەک کە بۆی دانراوە. مینی کلایمۆر بەناوبانگترین جۆری ئەو مینانەیە.

هەڵبەزە مین: ئەو مینەش تەقەمەنییەکی بچووکە یەکەمجار دەتەقێتەوە تەقەمەنییە سەرەکییەکانی هەڵدەستێ بۆ ئاستی هەناو پاشان مینەکە دەتەقێتەوە کە وا دەکات ئەو مینە قوربانی زیاتر بێت (١٠٠٪) رێژەکەی ئەو مینەیە کە تووشی دێت. وای لێدەکات ساچمەکان بۆ ڕووبەرێکی زیاتر بڕوات.

بەپەرەسەندنی تەکنەلۆجیای مین، مینی وا دروست کرا کە بەهەردوو جۆری مرۆڤ و ئۆتومبێل بتەقێتەوە هەروەها ئەو جیاوازییەش لەنێوان مینی تانک و دژە کەس نەمینێتەوە.

بەپێچەوانەی تەکنەلۆجیای مین، دروستکردنی مین زۆر بایەخی پێدرا لەلایەن سەربازەکان و سوپاکان لەسەر ئەوەش بایەخیان دایە بەپەرەسەندنی پەرت و بڵاو تەقینەوەی لە دوور. ئەو جۆرە مینەش یەکەمجار بەشێوەیەکی یەکجار زۆر لە ڤێتنام بەکار هات، ئەو جۆرە مینانەش بەناوی مینی پەرت و بڵاو یا دوورهاوێژ ناوبانگی دەرکرد. ئەوەش بەهۆی فڕۆکە و هەلیکۆپتەر کە لەژێر باڵەکانیان دادەنرێت یاخود بەتۆپ یا هاوەن یاخود مووشەک دادەنرێتەوە. زۆربەی ئەو جۆرە مینانە قەبارەیان بچووکە زۆربەشیان دوو کاریان هەیە دژە تانک و دژە کەس

بەیەک جۆریش دروست کراوە کە دەتوانی ١٧٥٠ مینی دژە کەس لە یەک چرکە فڕێ بدات، بەڵام هەلیکۆپتەرێک کە بەو شێوەیە دروست کراوە دەتوانێ ٢٠٨٠ مین فڕێ بدات و پەرت و بڵاوی بکات لە ماوەی سێ تاوەکو ١٦ چرکە، بەو شێوەیە زۆر بەئاسانی دەتوانێ کەم یان زۆر لە مین بچێنێ ئەمەش زۆر زەحمەت نەخشەی بۆ دادەنرێت ئەم مینانەش مەترسیان زۆر زیاترە لە مینی ئاسایی، زۆر جار ئەو مینانە ئەگەر لەو جۆرانە بێت کە بەخۆی نەمێنێ یاخود مەترسی نەمینێت. بەکارهێنانی ئەو جۆرە مینە ئەستەمە کە لەگەڵ پرۆتوکۆلی دووەمی ساڵی ١٩٨٠ کۆنگرەی UN بۆ چەکی تەقلیدی بگونجێ CCW.

مینی دژە کەسان ئەم جۆرانەی خوارەوەی هەیە:

بلاست BLAST: نیوەی خوارەوەی مرۆڤ بریندار دەکات و دەبێتە هۆی برینی زیاتر (مضاعفات).

بۆندینگ BOUNDING: تەلی سەر سمک پێکەوتوو دەبسترێن و لەگەڵ کەوتن لە تیرەکە بۆ ماوەی مەتر و نیوێک بەرز دەبنەوە و دەتەقن و ساچمەکانیان ماوەیەکی زۆر بڕ دەکەن.

مینی مگناتیکی: بەئاراستەی ئەو تەنە دەتەقێتەوە کە بوارە مەگناتیکییەکەی دەبڕێ.

مینی بەلەرە (ذبذبة): هەستیارێکی تێدایە هەست بە لەرەی هەموو تەنێکی بزوێن دەکات و بەئاراستەی ئەو تەنە دەتەقێتەوە.

مـــینی خـــانەی تیـــشک (الخـــلایا الـضـــوئیـــة): بەئاراستەی ئەو تەنە دەتەقێتەوە کە تیشکەکانی دەبڕێ.

**مینی دژە تانک**

ئەو جـۆرە مـینەیە کـە قـەبارەکـەی لە مـینی دژە کـەسـان گـەورەتر و کـاریگەریشی زۆر زیاترە، هەر شـتـێک بەسـەری دا بڕوات تێکی و پێکی دەدات: وەک تانـک، زرێپـۆش، ئۆتۆمـبێل، تراکـتـۆر و دەراسە.

## بەربلاوترین جۆرەکانی مین

بێوەژنە ڕەشە BLACK WIDOW: کە ناوەکە لە مێینەی جالجالۆکەیەکی ئەمریکی ژاهراوییەوە وەرگیراوە و لەگەڵ پێ لێنانی تەقینەوەیەکی گەورەی لێ دەبێتەوە.

پەپوولە: شێوەیەکی سەرنج ڕاکێشی هەیە و بۆ هەڵخەڵەتاندنی منداڵان بەکاردێت.

باڵەکان: کاریگەریی سنوردارە بەڵام دەبێتە هۆی چەندین جۆرە کەم ئەندامییەوە.

کۆڵەگە: لە ئاسن پێک دێت و ساچمەکانی بۆ ماوەی ١٠٠ مەتر بڵاودەبنەوە و لە ماوەی ٢٥ مەتری دووجای دەوروبەریدا دەکوژێ.

کلەی مۆر CLAYMORE: بەناوی شمشێرێکی ئەفسانەی سکۆتلەندییەوە ناونراوە، لە دوولاوە دەکوژێ ساچمەکانی بۆ ماوەی ٥٠ مەتر بڕ دەکەن و بۆ ماوەی ٢٠ ساڵ دوای ناشتنی کاریگەری دەمێنێ.

ڤالمارا: دژە کەسە و زۆر ترسناکە لە ئیتالیا دروست دەکرێ.

برۆسد ٣٣ BROSD33: بە هیلۆکۆپتەر فڕێ دەدرێ و ئامێری دژ بەهەڵگرتنەوەی تێدایە.

ئەلفا: رووسیە لەگەڵ پێ لێنان دەتەقێتەوە.

لەم ساڵانەی دوایی دەستکرا بەدروستکردنی مین لە پلاستیک و سیرامیک ئەمەش ئاشکرابوونی مەحاڵ دەبێ.

مـینی نویٚ هەن پێیـان دەوترێ مـینی بەهەست (زەیتـەڵە) کـە دوای ۳۰ ڕۆژ لە ناشـتنیـان دەتەقێتەوە.

جیاوازی مین و تەقەمەنی:

مین چەند جـیـاوازی بەرچاوی هەیە لەگـەڵ تەقەمەنی؟

مـین دوو جـۆرە دژە کـەس و دژە تـانـک، تەقەمەنییەکان هەمە جۆرن و جیـاوازن لە شێوە و قەبارە.

مین بەشـێـوەیەک دروسـتکراوە کـە بەرکـەوتە بیتەقێنێتەوە، بەڵام تەقەمەنی وا دروستکراوە کە بەسەر زەوی بکەوێت یا بەیاری کردن بتەقێتەوە.

مین چونکە شتێکی ترسناکە لەبەر ئەوە یەکسەر ناتەقێتەوە کـاریگەری درەنگ و کـاریگەریەکەی هەرەمەکی دەبێت، ئەویش تێکچوونی لەش و دەست و پێ و هەروەها کـوشتن بۆ خـەڵکی مـەدەنی و بێ گـوناه، بەڵام تەقـەمـەنی هەر کـە دەسـتت پێکەوت دەتەقێتەوە بەرکەوتەش یا بریندار یاخود دەکوژێت.

لە حـاڵەتی ئاسـاییـدا نەبینراوە و یان لەژێر زەوی دانراوە یا شاردراوەتەوە یاخود بەخۆڵ یا بەپیسایی یا سەوزایی داپۆشراوە. زۆربەی کێـڵگە مـینەکـان دیار نین پێمان ناکرێت دیاری بکەین کە بڵێین ئەوە کێڵگە مینە ئەو دڵنیا نەبوونە لە مین بەیەکێک لە خاڵە بەرچاوەکانی مین دادەنرێت کە وا دەکات ئەو

مینە ببێتە چەکێکی ترسناک و فێڵباز و هەروەها برینداركەر بەپێچەوانەوە تەقەمەنی کە هەردەم بەرچاوە و شوێنەکەشی یا کۆنە رەبییە یاخود گۆڕەپانەکانی جەنگە، لەبەرئەوە شوێنی تەقەمەنی زۆر بەئاسانی دەدۆزرێتەوە، یەک لە تایبەتمەندییەکانی مین ئەوەیە کە دادەنرێتەوە بەپێچەوانەی تەقەمەنی کە دەهاوێژرێت.

## بلاوبوونەوەی مین

بەدەگمەن مین بەتەنها دەدۆزرێتەوە، بەڵکو لە زۆربەی کاتدا بەشێوە کۆمەڵەی سێکوچکەیی کە پێک دێت لە سێ مین یا زیاتر دەدۆزرێتەوە ئەگەر بێت و مین بەشێوەیەکی دروست دابنرێتەوە ئەوا بەزەحمەتی دەدۆزرێتەوە.

بەپێی ئامارێک ١٢٠ ملیۆن مینی چێنراو هەیە لە خاکی ٦٥ دەوڵەتی جیهاندا چێنراون و ٢٠٠ ملیۆن مینی کۆگاکراو لە جیهاندا هەیە ئێستا نزیکەی ٦٠٠ جۆرە مین هەیە لە جیهان ئەو ژمارەیەش دابەشی سەر هەردوو جۆری دژی کەس و دژی دژی تانک دەبێت. بەپێی زانیارییەکانی پرۆژەی هەڵمەتی نێو دەوڵەتیی قەدەغەکردنی مینی زەمینی (ICBL).

وەک لە راپۆرتێکدا ئامـاژەی پێکراوە ئەم وڵاتانەی دووچاری گرفتی مین بوونەتەوە بریتین:

ئەفریقیا: ٢٤ دەوڵەت (سۆمالیلاند، چاد، جیبۆتی، مەلاوی، مۆزەمبیق، نامیبیا، نەیجەر، سەنیگال، باشووری ئەفریقیا، سویزلاند، زیمبابۆی، ئەنگۆلا، بۆرۆندی، ئەسیوپیا، گینیابیساو، کینیا، مۆریتانیا، رواندا، سودان، کۆنگوبرازافیل، کۆنگۆی دیموکرات، ئەریتیریا، لایبیریا، سۆماڵ).

ئەمریکای باشوور: ١٠ دەوڵەت (فالکلاندس، مالفیناس، کۆستاریکا، گواتیمالا، هیندۆراس،

نیکارگوا، پیرۆ، ئیکوادۆر، چیلی، کۆلۆمبیا).

ئاسیا: ١٧ دەوڵەت (تایوان، کەمبۆدیا، مالیزیا، تایلاند، بەنگلادیش، فلیپین، ئەفغانستان، بۆرما، چین، هیندیستان، کۆریای باکور، کۆریای باشوور، لاووس، مەنگۆلیا، پاکستان، سیریلانکا، ڤێتنام).

ئەوروپا و ئاسیای ناوەڕاست: ٢٤ دەوڵەت: (ئەبخازیا، بۆسنیا هرزۆگۆڤینا، بولگاریا، کرواتیا، دانیمارک، سلۆڤینیا، ئەلبانیا، قوبرس، چیک، یۆنان، لیتوانیا، مۆلدۆڤیا، ئۆکرانیا، ئەرمینیا، ئازربایجان، بیلاروس، ستونیا، جورجیا، قیرغیزستان، لاتڤیا، رووسیا، تاجیکستان، تورکیا، یۆگسلافیا).

باکوری ئەفریقیا و ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست: ١٦ دەوڵەت (کوردستانی عێراق؟!، بیابانی رۆژئاوا، فەلەستین، ئەردەن، تونس، یەمەن، جەزائیر، میسر، ئێران، عێراق، ئیسرائیل، کوێت، لوبنان، لیبیا، مەغریب، سوریا).

## کێن ئەوانەی مین بەرهەم دێنن

ڕێکخراوی مافی مرۆڤ و بەرهەمهێنانی مینی جیهانی توانیویەتی نزیکەی ١٠٠ کارگە لە ٤٨ وڵات دەستنیشان بکات، ئەم کارگانە زیاتر لە ٣٤٠ جۆرە مینی زەمینی دژ بەکەسانیان دروستکردووە، کە زیاتر لە ١٠ جۆر و ١٥٠ مینی زەمینی کە لە شوێنی تر نەناسراون. ئەم ڕێکخراوە پێی وایە چین و ئیتالیا و یەکێتی سۆڤیەتی پێشوو لەم ساڵانەی دواییدا گەورەترین بەرهەمهێن و فرۆشیاری مینی دژ بەکەسان بوونە، ڕێکخراوی چاودێری مافی مرۆڤ دەڵێ: لەوانەیە بەرهەمهێنەرانی مین ساڵانە ٥-١٠ ملیۆن مینیان بەرهەمهێنابێ و، تێچووی کۆبەرهەمی جیهان لە مین ساڵانە ٥٠-٢٠٠ ملیۆن دۆلارە.

جگە لەم سێ وڵاتەی سەرەوە ناویان هاتووە ئەم وڵاتانەی خوارەوە زۆرترین بەرهەمی مین بەرهەم دێنن:

ئەورووپای ڕۆژهەڵات: چیکۆسلۆڤاکیای پێشوو، ئەڵمانیای ڕۆژهەڵاتی پێشوو، یۆگسلاڤیای پێشوو.

ئەورووپای ڕۆژئاوا: بەلجیکیا، نەمسا، فەرەنسا، یۆنان، سوید.

دەوڵەتانی تر: میسر، هیندستان، ئیسرائیل، پاکستان، سینگاپورە، ئەفریقیای باشوور، ئێران، عێراق، هەردوو کوریای باکور و باشوور.

بەپێی ئامارێکی ئاژانسی زانیاری سەربازیی

ئەمریکا ولاتانی چین و میسر و پاکستان و ئەفریقیای باشوور بازرگانییەکی بەهێز لەبواری میندا دەکەن. هەروەها ئەو راپۆرتە ئاشکرای کردووە کە ولاتانی بەلجیکیا، چیلی، یۆنان، ئیسرائیل، پورتوگال، سینگاپورە، ئیسپانیا و یوگسلاڤیای پێشوو لەم سالانەی دواییدا سەرچاوەیەکی گرنگن بۆ ناردنە دەرەوەی مین. هەروەها ئاشکرای کردووە کە ویلایەتە یەکگرتووەکان لە سالی ١٩٦٩ ەوە ٤,٣ ملیۆن مینی دژەکەسانی ناردۆتە دەرەوە و لە ١٠ سالی رابردوو ١٥٠ هەزار مینی لەم جۆرەی ناردۆتە دەرەوە.

## کێن ئەو وڵاتانەی مین ئەمباردەکەن؟

زۆرن لەو وڵاتانەی تاوەکو ئێستا مین هەڵدەگرن و ئەمبار دەکەن، چین ١١٠ ملیۆن مینی ئەمبارکراوی هەیە، رووسیا ٦٠-٧٠ ملیۆنی هەیە، بیلاروس بە ملیۆنی هەیە، ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا ١١ ملیۆنی هەیە، ئۆکرانیا ١٠ ملیۆن، ئیتالیا ٧ ملیۆن، هند لە ٤-٥ ملیۆن، سوید ٣ ملیۆن، ئەلبانیا ٢ ملیۆن، کوریای باکور ٢ ملیۆن، یابان ١ ملیۆن، بەڵام خەریکە لەناوی دەبات، ئینگلیز ٨٥٠ هەزار، فەرەنسا ٦٥٠ هەزار، ئیسپانیا ٥٩٥ هەزار. هەروەها لەو بڕوایەی زۆر وڵاتان مینی ئەمبارکراویان هەبێت بەڵام ناویان نەبراوە چونکە ئاشکرایان نەکردووە لەم وڵاتانەش: رژێمی عێراقی پێشوو مینێکی ئەمبارکراوی بێ ژماری هەبوو بەڵام ئاشکرای نەدەکرد، ئێران، یوگسلاڤیا، پاکستان، میسر، ئیسرائیل، یۆنان، ڤێتنام... هتد. کۆی گشتی هەموو ئەو مینە ئەمبارکراوانە بە ٢٥٠ ملیۆن مین دەخەملێندرێ.

## کێشەی ژمارە

مینی زەمین کێشەیەکی جیهانییە، بەڵام زەحمەتە بتوانین پێوانەی گەورەییەکەی بەتەواوەتی بکەین. ژمارەی ڕاستی مینی چاندراو و ژماردی ئەم خەڵکانەی کە زەرەرمەند بووینە بەهۆی مینەوە

زۆرن، بەڵام بەتەواوەتی ناتوانین وەریبگرین. بەکارهێنانی ژمارەیەکی زۆر مین لەو چەند ساڵەی دوایی بەکارهات لەسەر ئەو ململانێیە جیاجیانەی نێوان وڵاتان لە چەند بەشێکی جیاجیای جیهاندا. دەبینرێ ئەو ژمارە زۆرەی کە لە مین چێندراوە زۆر بەنارێکی و بێ نەخشە چاندراوە ئەمەش هەڵگرتنەوە و لەناوبردنی زۆر زەحمەت کردووە. زۆربەی ئەوانەی مینیشیان چاندووە بێ گوێدانە هیچ مافێکی مرۆڤ لە هەموو شوێنێک مینیان بڵاوکردۆتەوە. ئەو ژمارانەی کە لەبەردەستیش بن تەنها خەملێندراوە هیچ ژمارەیەکی راست و دروست لەبەر دەست دا نییە، ژمارەی فعلی مین بەگرنگی گەورە ناژمێردرێ و ناگاتە گرنگی بۆ نموونە ژمارەی ئەم کێڵگە مینانەی جۆری و قەبارەی گەورەیی ئەو شوێنەی کە زەرەرمەندە و ژمارەی ئەو خەڵکانەی کە پێی زەرەرمەندبووینە ناژمێردرێ. هەر لەبەر ئەوەشە ژمارەی ڕاستی مینی چاندراو نادیارە و لەبەر هەر هۆیەک بێت راستی ئەم نادیارییەش بەشێکە لە کێشەکە. لێرەدا ژمارەی خەملێندراو هەیە با دووبارە بگەڕێینەوە سەر ژمارەکان بزانین چیمان پێ دەڵێت:

١٢٠ ملیۆن مین لە ٦٥ وڵاتی جیهاندا چێندراوە جگە لەوەی کە دەخەملێندرێ ٢٠٠ ملیۆن مین کۆگا کرابێت.

٥٢ ملیـــــــۆن مین لە ٢٣ وڵاتی ڕۆژهەڵاتی

ناوەڕاســـتــدا چێنراون کــە ١٢ لەو وڵاتانە وڵاتـی عـەرەبین لە ئەفـریقـیـا کـە ٣٣ ملیـۆن مـینیـان تێدا چێندراوە و ١١ وڵاتیـان عـەرەبن لە ئاسـیـا کـە ٢٠ ملیۆن مینیان تێدا چێندراوە.

١٨ ملیـۆن مین لە ٩ وڵاتی ئەفـریقـیـادا چێنراون، جگە لە ١٢ وڵاتە عەرەبییەکە.

٤٠ ملیـۆن مین لە ١٤ وڵاتی ئاسـیـادا چێنراون. جگە لە ١١ وڵاتە عەرەبییەکە.

٨ ملیـــۆن مین لە ٢٠ وڵاتی ئەوروپادا چێنراون شەشیان لە ڕۆژهەڵاتی ئەوروپادان ٢٥ هەزار مینیان تێدا چێندراوە و، ١٤ وڵاتی ڕۆژئاوای ئەوروپا زیاتر لە ٧ ملیۆن مینیان تێدا چێندراوە.

٢٠٠ هـەزار مـین لە ١١ وڵاتـی ئـەمـــــریـکـای باشووردا چێندراوە.

لە میسر ٢٣ ملیۆن مین چێندراوە.

لە کـوردسـتـانی عـێـراق نزیکەی ٢٠ تا وەکـو ٢٢ ملیۆن مین چێندراوە.

لە لیبیا ٥ ملیۆن مین چێندراوە.

لە ئەنگۆلا ١٥ ملیۆن مین چێندراوە.

لە ئەفغانستان ١٠ ملیۆن مین چێندراوە.

لە بۆسناهرزۆگۆفینیا ٢ ملیۆن مین چێندراوە.

لە سلفادۆر ٢٠ هەزار مین چێندراوە.

تۆژینەوەکـان ئەوەیان روونکردۆتەوە کـە تاوەکـو ئێـسـتـا ژمـارەیەکی زۆری مـینی چێندراو هەیە لە ئەورووپای ڕۆژئاوا و باکـوری ئەفـریقـیـا لە شـەڕی

دووەمی جیهانیدا چێندراون. زۆربەی زۆری مینی چێندراو دەرئەنجامی شەڕی ناوەخۆ و کێشەی سەر سنوورییەکان و کێشەی ئایینی و ڕەگەزایەتین کە لە کاتی شەڕی ساردا روویانداوە.

هەندێ دەوڵەت کە مینیان تێدا چێندراوە بۆ خۆیان دەستیان لەو کارەدا نەبووە وەکو میسر و لیبیا کە لە شەڕی دووەمی جیهانیدا زۆر لە ناوچەکانیان مین ڕێژکراون و، وڵاتانی کەنداو و کوردستان بەهۆی شەڕەکانی عێراق دژ بە کوێت و ئێران. جگە لەمەش زۆربەی ئەو وڵاتانەی کێشەیان هەیە مینەکانیان ئاشکرا ناکەن وەکو سوریا و ئیسرائیل و تورکیا.



پەیمانی ڕاگرتنی مینی دژ بەتاکە کەس

## هەڵمەتێکی دژە مین

ولآتانی جیهان شان بەشانی یەک بە یەک دەنگ ئاشکرایان کرد کە دژ بە کێڵگەکانی مین و ئەم بانگەوازەیان بەکردەوە سەلماند لەپێناو لەناوبردنی ئەم کێڵگانەدا کە بەردەوام قوربانیان هەیە. ڕۆژی ۳ی کانوونی یەکەمی ساڵی ۱۹۹۷ ڕۆژێکی گەش و زیندووە لە مێژوودا، چونکە لەم ڕۆژە حکوومەتی زیاتر لە ۱۰۰ دەوڵەت بەرەسمی پەیمانیان دا بەرهەمهێنان و بەکارهێنان و گواستنەوەی مینی دژ بەتاکەکەسان، ئەو ئامرازە بەدفەڕە مەرگهێنە رابگرن. ئەم کردەوە بەرچاوەی لە ئۆتاوا رووی دا سەرکەوتنێکی مەزن بوو لەو جەنگەی کە دژ بەپەتایەک کە دەستکردی مرۆڤە و لە هەموو سووچێکی جیهاندا بڵاوبۆتەوە، ئەوەتا کۆمەڵگەی نێودەوڵەتی دوای چاوەڕوانێکی زۆر چاوی هەڵدێ بە ڕێککەوتنێک کە گەمارۆی ئەم دوژمنە شاراوەیە دەدا، کە پێی دەڵێن مینی دژ بەتاکەکەسان، ئەو دوژمنەی بووەتە هۆی کەوتنەوەی قوربانییەکی لە ژمار نەهاتوو و ژان و ئێشی بێ هاوتای بۆ مرۆڤایەتی دروست کردووە.

لەم ڕێکەوتننامەیە بڕیاردرا لە ماوەی چوار ساڵ مینە نەمبارکراوەکان بتەقێندرێنەوە و لە ماوەی ۱۰ ساڵیش مینە چێندراوەکان. ئەمە بوو شاکاری ئەو هەڵمەتەی کە ماوەی ٥ ساڵ بوو بەردەوام بوو لە

١٩٩٢-١٩٩٧ كــه بەچالاكــيــــەكی ســـادەی ڕێـكخـــراوێـكی ســـادە، ڕێـكخـــراوی ناحكوومی ئەمریكی دەستی پێكرد كە لەبواری چاودێری كردنی قـوربانیـانی شـەڕی ڤـێتنامی دەكـرد بەسـەرپەرشـتی خـاتوو (جـودی ویلیـامـز) كـە ئەمـریـكـیـیـە چەندین ناوچەی لێ قـەومـاوی بەسـەركـردەوە و لە ڕۆژنامـە جـیـهـانیـەكاندا باسی لەسـەر بڵاوبوونـەوە، هەروەها ١٠٠٠ ڕێـكخـــراوی ناحكوومی بۆ پشـــتـیـــوانی كارەكەی تەیار بدات بەهاوكاری لیژنەی نێودەوڵەتی خـــاچ و مـــانگی ســـوور و نەتـەوە یەكگرتـووەكـــان. ئامانجی ئەم ڕێككەوتننامەیە پاككردنەوەی جیهانە لەم چەكە و پێشكەشكردنی یارمەتییە بۆ قوربانیانی و ڕووبەڕووبوونەوەی ئاســـتـــەنگەكـــان لە ڕێی جێبەجێكردنی كاریگەری ڕێككەوتننامەكە لەسەر ئاستی مەیدانیدا.

بڵاوبوونـەوەی مـــینی ژێرزەمین لە جـــیـــهـــاندا كارەساتێكە لەم سەردەمەدا، لە كاتێكدا مینی دژ بە تاكەكەسان بۆ ڕێگرتن لە پێشـڕەویی خـێرایی هێزی دوژمن یان پاراســتـنی دامــەزراوە ســەربازییــەكــان دروست كران. كـەچی ژمارەی قـوربانیـانی سەرباز و چەكدار. ئەم ئامێرە بەدفەڕانە چەندین ساڵ بەكارایی دەمێننەوە و بەردەوام دەبن لە كوشتن و پەكخـــستنی پیـاو و ژن و منداڵ بێ جیـاوازی. ئەم مـینانە زەویی بەپیت دەكاتە زەوییەكی بێ سوود و ڕێ لە هاتوچۆی مـــرۆڤ دەگـــرێ و لەوانەش ڕێگرتـن لە گـــەڕانەوەی



منداڵێکی پەککەوتەی مین لەکاتی پەیماننامەی ڕاگرتنی
مینی دژە تاکەکەسی

پەنابەران بۆ سەر زێدی خۆیان. بۆیە ئەو زیانانەی ئەم چەکە لە مرۆڤایەتی داوە زۆر زیاترە لە قازانجە سەربازییەکان.

ڕێکەوتنی ئۆتاوا گوزارش لە ناڕەحەتییەکی گشتی دەکات بەرامبەر بەم چەکە کارەساتاوییە و لە قەناعەتی زۆربەی سەرکردە ئەوروپییەکان دەکات بەوەی کە مینی دژ بە تاکەکەسان چەکێکی زۆربەی سەرەکی نییە لە کردە سەربازییەکاندا. بەڵام پێش هەموو شتێک ئەم ڕێککەوتننامەیە داوایەکی گشتییە کە زیاتر لە هەزار ڕێکخراوی ناحکوومی و ئینسانی و کۆمەڵەی قوربانیان گوزارشتیان لێ کردووە و سەرکردەی حکوومەتەکان جێبەجێیان کرد کاتێک بەدەنگی هەموو ئەمانەوە هاتن. بەرهەمی

هەوڵی تەشریعی بەردەوام و بێوچانە کە زیاتر لە سەد وڵات بەشدارییان تێدا کرد و زۆربەی وڵاتان مۆریان کردووە و زۆر وڵاتیش پەسندیان کردووە.

مینی دژە کەس لەماوەی (٥٥) ساڵ قوربانییەکانی زۆر زیاترە لە چەکی ئۆتۆمی و چەکی کیمیاوی و هتد... ICRC (خاچی سووری نێو دەوڵەتی) وا مەزندە دەکات کە ٨٠٠ کەس مانگانە دەبنە قوربانی مین هەروەها ١٢٠٠ کەسیش تووشی پەککەوتەیی دەبن بەهۆی مینەوە. کۆی ئەوانەش دەکاتە ٢٠٠٠ کەس مانگانە، واتە هەر ٢٢ دەقەیەک یەکێک دەبێتە قوربانی مین جا چ بە کوشتن یاخود بە برینداربوون. زۆربەیان ئەوانەی بەر مین دەکەون خەڵکی بێ تاوان و خەڵکی هەژارن لە ولایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا یەک پەککەوتوو لە کۆی ٢٢ هەزار کەس دەبێت، بەڵام لە کەمبۆدیا کە بەیەکێک لەم وڵاتانە دادەنرێت کە زەوییەکی زۆری بەر مین کەوتووە لە کۆی ٣٨٤ کەس یەک قوربانی مینی تێدا هەیە. بەڵام لە وڵاتی ئەنگۆلا لە کۆی ٣٣٤ کەس یەک قوربانی مینی هەیە، کە ئەمەش یەکێکە لە هەڕەشەیەکی زۆر گەورە بەرامبەر بەمرۆڤایەتی. نزیکەی ١,٥٪ لەو خەڵکە بریندار بوونە لەبەر مین، یاخود لەبەر تەقەمەنی نەتەقێندراو، لە ساڵی ١٩٧٩ ICRC زیاتر لە ١٠٠٠ دەست و پێی دەستکردی دروست کردووە بۆ زیاتر لە ٨ هەزار پەککەوتە لە ٤٥ پرۆژە لە ٢٢

ولآت بەتەنیا لە ساڵی ١٩٩٦ زیاتر لە ١٠ هەزار دەست و پێی دەستکردی دروست کردووە. لە مانگی ٧ ساڵی ١٩٩٧ ICRC ١٩ پرۆگرامی چارەسەری لەشی کردووە لە هەشت ولآت کە هەموویان بەهۆی مینەوە لەشیان شێواوە لەم ولآتانەش ئەفغانستان، ئەنگۆلا ، ئازربایجان،کەمبۆدیا ، جۆرجیا ، کوردستانی عێراق، کینیا ، روەندا.

ملیۆنەها مین کە زۆربەیان مینی دژەکەسە زیاتر لە ٦٥ ولآت دابەش کراودا لە ئەفریقیا و ئاسیا و ئەوروپا و ڕۆژهەلآتی ناوەڕاست و ئەمریکا. ئەو ولآتانەی کە زۆر بەسەختی تووشی ئەم کێشەیە بووینە ئەفغانستان و ئەنگۆلا و بۆسنە و کەمبۆدیا و کرواتیا و ئەریتیریا و کوردستانی عێراق و مۆزەمبیق و سۆماڵ و سودان و ڤێتنام. هیچ ڕێگەیەک نییە کە بزانرێت ژمارەی راستی کێڵگە مینەکان کە تاوەکو ئێستا دانراون چەندە. لە زۆر شەڕە تازەکان لە ئەفغانستان و بۆسنە و کەمبۆدیا لەم شوێنانە کێڵگە مینەکان دیار نین چونکە زۆر بێ بەرنامە زەوییەکان مینڕێژ کراون. ئەو مینە دژە کەسانە هەردەم ئازاری ئەو کەسانە دەدات کە کەمترین توانایان هەیە ناتوانن خۆیان بۆ نموونە لە مین بپارێزن لە کەمبۆدیا ٦١٪ و لە ئەفغانستان ٨٤٪ بەبەردەوامی قەرزارن چونکە پارەی خۆیان هەمووی بۆ چارەسەرکردن سەرف دەکەن بۆ دروستکردنی دەست و پێی دەستکرد لەو ولآتە

نامــیــانه ۳۰۰۰ دۆلاری دەوێت ئەمــەش پارەیەکی زۆرە کــە زۆربەی خــەڵک ناتوانن پەیدای بکات لەبەرئەوەشــە زۆربەی قــوربانیــانی ئەم مــینانە لەو وڵاتانە قەرزارن.

۷۵۰ ملیۆن دۆلار کۆی گشتی پارەی ۲۵۰ هەزار بەرکەوتەی مینە لە هەموو جیهان ئەوەش بەگوێرەی ئاماری نەتەوە یەکگرتووەکانە.

نەتەوە یەکگرتووەکــــان وا دەخــــەملێنن بۆ دروســتکردنی یەک مــینی دژە کــەس ۳ تاوەکــو ۳۰ دۆلاری تێ دەچێت کــەچی خــاوێنکردنەوەی ئەو زەوییــەی کــە ئەو مــینەی تێدا چێندراوە لە ۳۰۰ تاوەکـــــو ۱۰۰۰ دۆلاری تێ دەچێت، ئەوەش پارەیەکی زۆرە کە زۆربەی وڵاتەکان ناتوانن کێڵگە مینەکان پاک بکەنەوە. بۆ دۆزینەوەی مین سێ ڕێگا بەکاردێت: مین دۆزەرەوە (كاشفة الغام)(*) باشترین ڕێگاش بۆ دۆزینەوەی مین ڕێگای دیماینەرە واتە مین دەرهێنەر کە سوود لە (كاشفة الالغام) دەبینێ، کە بەباشترین ڕێگا دەژمێردرێت بۆ هەڵگرتنەوەی مین.

(*) بۆ دۆزینەوەی مین لە کــوردســتــان زۆرتر گــرنگی بە (كاشفه الالغام) دەدرا، چونکە ناوچەکانی مینیان لێیە لە کوردســتــان زۆربەی ناوچەی شــاخاوییە بۆ دەرهێنانی مــینش لەم ناوچانە کــاسحەی مین زۆر بەزەحمەت بەکــار دەهێنرێت. ڕێگا بــاوەکــــانی پــاککــردنەوەی مــین لە کوردستاندا بێڵ (خاکەناس) و سەگە.

لێکۆڵینەوەیەک لە ئەفغانستان و کەمبۆدیا و بۆسنە و مۆزەمبیق بەدیارکەوت کە ژمارەی ڕووداوی مین لەم چوار وڵاتە زۆر زیاترە لە چەندساڵی پێشتر چونکە ئەو چەند ساڵە مین بەرێژەیەکی کەم لەو ناوچانە بوو لە ساڵەکانی ١٩٨٠-١٩٩٠.

## بەکارهێنان و خراپییەکانی مین

مین بەشێوەیەکی سەرەکی چەکێکی بەرگرییە، چەکێکی مەیدانی تەکتیکییە بەکاردێت بۆ بەرگری پێگەکانی سەربازی و شوێنە گرنگەکان هەروەها بۆ ترساندن و لەسەرخۆ بوونەوەی هێرشی دوژمن. هەروەها دەبێتە رێگر بۆ شوێنە ستراتیجییەکان. مین پاسەوانێکە هەردەم ٢٤ کاتژمێر بەئاگایە کاری خۆی جێبەجێ دەکات لەهەر کەشوهەوایەک بێت بەفر بێت یا باران یاخود گەرم بێت. دروست کراوە بۆ پەککەوتن زیاتر لە مردن، مین تەنها قوربانییەکەی وا لێناکات شەڕ بەجێ بهێڵێت بەڵکو وا لە سوپاکە دەکات کەوا ترسێک بکەوێتە ناویان. کاروباری سەربازی خاو دەکاتەوە و، سەرباز زۆر ئاگاداری خۆی بێت بۆیە ناویشیان ناوە دوژمنی شاراوە چونکە لە هەموو کاتێک دەبێت چاوەڕوانی ئەوە بێت کەوا دوژمنێک لەبەر دەمتە، تەقینەوەی مین بۆ سەربازێک لە جەنگدا نسکۆیەک بۆ سەربازەکانی دیکە دروست دەکات کەوا دەکات کاتی هێرش کردن بەرەو نووچدان ببات. بۆیە زۆر جار وا دەکات لەلایەنی هێرشبەر زۆر ئاگاداری خۆیان بن بەترسەوە بجووڵێنەوە.

ئەفغانستان، کەمبۆدیا، ئەنگۆلا، سۆماڵ، سلفادۆر و یوگسلافیای پێشوو ئەمانە هەموویان نموونەن بۆ شەڕی ناوەخۆ کە مین لەم شوێنانە بەم




یەکێک لە نیشانەکانی مین

جۆرە بەکار هاتووە.

لە یوگسلافیای پێشوو گوندەکان، ڕێیەکان، وێستگە کارەباییەکان، پردەکان و بەنداوەکان هەتاوەکو کەمپی ویلایەتە یەکگرتووەکان ئەوانە هەموو مینڕێژ کرابوون. ئەم مینانەش بەهۆی شێوە مینی دوور هاوێژ مینیان دەچاند کە ژمارەیەکی زۆر مین لە یەک کاتدا دەچێندرا. پەرەساندنی ئەو سیستەمەی چاندنی مین لە هەندێ کات زۆر بەخێرایی پەرەدەسێنێ کە وای لێهات سروشتی بەکارهێنانی مین لە شەڕدا گۆڕا وەکو جاران نەما. دروستکردنی نەخشە بۆ ئەم جۆرە چاندنەی کێڵگەی مین بەڕاستی ئەستەمە، ئەمەش دەبێتە هۆی ئەوەی بەردەوام خەڵکی مەدەنی ژیانیان بکەوێتە مەترسی هەتا پاش ئەوەی جەنگیش نەمێنێ.

لە بیست ساڵی رابردوودا وا دەبینین زیادبوونی بەکارهێنانی مین وەکو چەکێک بەکاردێت بۆ تۆقاندنی خەڵکی مەدەنی. ئەو مینانەش بۆ ئەوە بەکاردێت بۆ ئەوەی خەڵک ناوچەی خۆی چۆڵ بکات بۆ ئەوەی خەڵک نەتوانی بچێتە ناو ماڵ و حاڵ و بۆ کێڵگە و بۆ شوێنە گشتییەکان و رێگای کارەبا. ئەمەش ئەنجامی زۆر خراپ دەبێت کە خەڵک ناچار دەکات ماڵی خۆی چۆڵ بکات ئەم هەڵسوکەوتەش دژی بەندەکان و رێساکانی مافی مرۆڤە.

لە هەندێ لە شوێنەکانی ئەفغانستان کاری رۆژانەی ٨٧٪ خێزانەکان بە مین تێکچووە، بەبێ کێڵگەی مین دەتوانێت لە زۆربەی شوێنەکانی ئەفغانستان لە ٨٨٪ بۆ ٢٠٠٪ زیاد بکرێ و هەمان شێوە بە ٣٥٪ لە کەمبۆدیا کە ئەو دوو وڵاتە لەو وڵاتانە دەژمێردرێت کە زۆر مینی تێدا چێندراوە.

لە پۆڵەندا لە ناوەڕاستەکانی حەفتاکان ٤ هەزار قوربانی و ٩ هەزار پەککەوتە بەهۆی مینی شەڕی دووەمی جیهانی بوونە قوربانی هەرچەند لەو ماوەیەش ١٥ هەزار ملیۆن مینیان لە زەوی دەرهێنابوو.

## مین وەکو چەکێکی تیرۆری

بەرە بەرە وا خەریکە مین لە کاری سەرەکی خۆی کە چەکێکی بەرگری و تەکنیکییە لە گۆڕەپانی جەنگ دەگۆڕدرێت بۆ چەکێکی هێرشی ستراتیجی. مینیش هەردەم کە دەچێندرێت بەمەبەستی ئەوە دادەنرێت کە خەڵکی مەدەنی بەربکەوێت بۆ ئەوەی کەشوهەوایەکی تیرۆرستانە دروست بکات، هەروەها بۆ ئەوەی سەرچاوەی خۆراک لەناو ببات شەپۆلێکی کۆچبەرانە دروست بکات، یاخود بەشێوەیەکی سادە مەبەستی ترسان و تۆقاندن یاخود هێزەکانی دیکەی ناو شەڕ. ئەمەش لەبەرئەوەی ئەو هێزانەی کە شەڕی دژی حکوومەت دەکەن سەرچاوەی پارەیان کەمە مینیش چەکێکی هەرزانە جگە لەمەش مین زۆر کاریگەریەکی بەهێزی هەیە لە ترساندن و تۆقاندنی خەڵکی مەدەنی بۆ چەند ئامانجێکی سیاسی بۆ نموونە خەڵک هەڵدەستێننەوە.

هەرچەندە بەکارهێنانی مین دژی خەڵکی مەدەنی لەلایەن حکوومەتەکان و سوپایە نیزامییەکان بەکار هاتووە بۆ نموونە رژێمی عێراقی مینێکی زۆری لە ناوچە شاخاوییەکانی کوردستان چاند، هەرچەند ئەم مینانەش حکوومەت زۆر چاکی دەزانی بەر رێگای ئیش و کاری خەڵکە و هیچ هێزێکی چەکداریشی لێ نییە لەگەڵ ئەوەش مینرێژی دەکرد. بەهەرحاڵ چاندنی مین دژی خەڵکی بێ گوناه یەکێکە لە

پێشێلکردنی بەندەکانی مافی مرۆڤ کە بەهیچ شێوەیەک نابێت خەڵک لەسەر ماڵ و حاڵی خۆی و سەر کێڵگە کشتوکاڵیەکانی دوور بخرێنەوە، مەبەستیان لە دوورخستنەوەی برسێتی خەڵکە بۆ ئەوەی ببێتە چەکێک لەژێر دەستیان.

ئەم ستراتیجیەش زۆر بەربڵاوە کە بووە هۆی ئەوەی کۆنگرەیەک لەسەر ئەو کێشەیە ببەستری (مونرو) لە سویسرا لە ساڵی ١٩٩٣ کە ڕێکخراوی ICRC پێی هەڵسا لەم کۆنگرەیەش زۆربەی شارەزایە سەربازییەکان و پسپۆرەکانی بواری مرۆیی و هەروەها ڕۆژنامەنووسەکان بەشداربوون زۆر ڕاشکاوانەش دانیان بەوە دانا کە مین بەکاردەهێنرێت بۆ بڕینی نانی خەڵک و کوشتنی خەڵکی بێ گوناه، ئەم مینانەش بۆتە کارێکی ئاسایی بەربڵاو دژی خەڵک.

## مین باجی مرۆیی (الضريبة البشرية)

لێدانی مین هەڕەمەکییە واتە جیاوازی لەنێوان خەڵک ناکات، کەسیش ناپارێزێت باجەکەشی بۆ هەموو خەڵکە زیاتریش خەڵکی مەدەنی دەکوژێت و بریندار دەکات کاتێ کە شەڕ دەوەستێت نەک لە کاتی شەڕدا.

نزیکەی چارەکی قوربانیانی مین ڕێکخراوی ICRC چارەسەریان دەکات لە ساڵی ١٩٨٥ تاوەکو کۆتایی مانگی سێی ١٩٩٥ نەخۆشخانەکانی ICRC تیمە پزیشکییەکانی ICRC ١٤٠ هەزار قوربانییەکانی شەڕیان چارەسەر کرد کە ٣٠ هەزاریان قوربانی مین بوون. ئەم ژمارەیەش بەشێکی زۆر بچووکی برینداری شەڕەکانن کە ڕوو دەدات. لە دوو نەخۆشخانەی کەمبۆدیا ٥٥٪ بریندارەکانی شەڕ قوربانی مین بوون لە هەندێ وڵات ڕێژەی ژن و منداڵ کە دەبنە قوربانی کێڵگەی مین دەگاتە ٣٠٪ ، هەرچەندە زۆربەی زۆری قوربانیانی مین پیاون زۆر جارانیش سەربازن بەم ڕێژەیە ٨٧٪ لە کەمبۆدیا ٧٥,٨٪ لە ئەفغانستان ڕێژەی قوربانی مینی پیاوەکانی ئەم دوو وڵاتەیە. لە نامیبیا ٨٨٪ قوربانیەکانی کێڵگەی مین خەڵکی مەدەنی بوون بەڵام لە مۆزەمبیق لە ساڵی ١٩٩٤ ڕێژەی قوربانی خەڵکی مەدەنی ٦٨٪ بوو لێکۆڵینەوەیەکی ICRC دەری کرد کە ٨٠٪ قوربانییەکانی مین لە جۆرجیا



لەکاتی بەرکەوتنی یەکێک لە دیمایینەرەکان

نێوان ساڵانی ١٩٩٤-١٩٩٥ خەڵکی مەدەنی بوون. لە نەخۆشخانەی (مۆنگۆل بۆری) لە کەمبۆدیا کە چارەسەری قوربانییەکانی مین دەکات لە ساڵی ١٩٩٤-١٩٩٥ ڕێژەی ٣٥,٦٪ خەڵکی مەدەنی بوون ٦٤,٤٪ سەربازبوون. لەنەخۆشخانەی ICRC لە (کویتا) لە پاکستان ڕێژەی ٢٣,٢٪ لە قوربانییەکانی ئەفغانستان منداڵ بوون. مەڵبەندی زانیاری تەکنەلۆجیای زانستی نەخۆشی خێرا (CLET) لێکۆڵینەوەیەکی لەسەر کاریگەری مین لە ئەفغانستان، بۆسنە، کەمبۆدیا و مۆزەمبیق کرد و لە ئەنجامدا بینرا کە هەر یەک لە ١٠ قوربانی یەکێکیان منداڵە بەپێی چەند سەرچاوەیەک ٨٥٪ قوربانی مینی منداڵەکان دەمرن پێش ئەوەی بگەنە نەخۆشخانە، بۆیە لە هیچ ئامارێکدا ڕێژەی منداڵ

بەچاکی دەرناکەون ئەم هۆیەش دەگەڕێتەوە بۆ ئەوەی
منداڵ لە هەموو کەسێک زیاتر دووچاری مین و
مەترسی مین دەبنەوە، پێکهاتەی لەشی منداڵیش
زیاتر نزیکترە بۆ تەقینەوەی مین. هەروەها
پێکهاتەی لەشی منداڵ زۆر بەزەحمەتی دەتوانێ
بەرەنگاری ئەو ئازارە بکات، چونکە منداڵ
بەسروشتی خۆی حەز لە یاری و گەمە دەکات بۆیە
زۆربەی ئەوانەی کە بەر مین دەکەون سەرئەنجامیان
مردنە، زۆربەی ئەو منداڵانەی کە لەشیان بەر مین
دەکەوێت پاش چەند ساڵێک دەبێت نەشتەرگەریان
بۆ بکرێت بۆ نموونە ئەگەر منداڵێک قاچی بەر مین
کەوت دەبێت دوای چەند ساڵێک قاچی ببڕیتەوە
چونکە منداڵ گەشەی پێست و ئێسکی جیاوازی
هەیە. بۆسنە لە ساڵی ١٩٩٦ بینرا بەبەردەوامی ٥٠
کەس بریندار دەبن بە مین و تەقەمەنی نەتەقێندراو
(UXO) ڕێژەی ٩٠ ٪ پیاون کە کار دەکەن لە
زەوییەکانیان ٢٠ ٪ منداڵن لە ١٨ ساڵ تەمەنیان
کەمترە کاتێک کە یاری دەکەن. ڕێژەی ٣ ٪
قوربانییەکانی مین لە ئەفغانستان ئافرەتن، ڕێژەی
٥ ٪ لە کەمبۆدیا ١٦ ٪ لە مۆزەمبیق ئافرەتن
هەرچەند کۆی گشتی قوربانییەکانی مینی ئافرەت
کەمە. لە زۆر کۆمەڵگا کاتێک کە ئافرەت تووشی
مین دەبێت دەردەسەرییەک تووشیان دەبێت چونکە
ئەو ئافرەتەی کە بەر مین دەکەوێت پێکهاتەی لەشی
دەشێوێندرێ ئەوەش وا دەکات کە ئەو ئافرەتە

بێنێتەوە واتە کەس نەیهێنێ ئەگەر ئافرەتی خاوەن مێردیش بێت ئەوە لە وڵاتە دواکەوتووەکان پیاوەکان بیر لەوە دەکەنەوە ژنی بەسەر بهێنێت ئەوەش نەخۆشییەکی دەروونی بۆ ئافرەتەکە دروست دەکات کاریگەریەکی زۆری دەبێت بۆ سەر خێزان، کۆکردنەوەی دار و بەخێوکردنی منداڵ لەنێو زۆربەی کۆمەڵگاکان ئافرەت دەیکات کە ئافرەتیش تووشی کێشەی مین بوو بەزەحمەت ئەو کارە بەپیاو دەکرێت، لەبەرئەوەشە مین گەورەترین و زەرەرمەندترین کێشەیە بۆ ئافرەت و کۆمەڵگا، رێژەی قوربانییەکانی مینیش لەناوچەیەک بۆ ناوچەیەکی دیکە جیاوازە. لێکۆڵینەوەیەکی (CLET) ٦٪ دانیشتوانەکان لە چوار وڵات بەسەختی مینرێژ کرایە کە یەکێک لەم وڵاتانە ئەفغانستانە کە لە هەر ١٠ کەسێک یەک کەس تووشی مین بووە لە لێکۆڵینەوەیەک لە هەرێمی (مانیکا) لە مۆزەمبیق تەخمین کرا کە ٢١١٢ پەککەوتوو هەیە و ٢٣٧٦ کێشەی مردن هەیە کە هۆکارەکەشی مینە ١٩٨٠-١٩٩٣.

بەڵام ژمارەی راستی ئەو قوربانییانە زۆر زیاترە لەو ژمارەیەی کە نیشاندرایە، زۆربەی قوربانییەکانی مین تەمەنیان لە ٤٥ ساڵان کەمترە، ئەو کێشەیەش مرۆڤ تووشی کەمی دەرامەت و لێکدابڕان و رەشبینی دەکات. لە لێکۆڵینەوەیەکدا دەرچوو لە کەمبۆدیا لە هەر ٣٨٤ کەس یەک

بەرکەوتووی مین هەبوو، بەڵام لە ئەنگۆلا لە هەر ٣٣٤ کەس یەکێک دووچاری کێشەی مین دەبێت کەچی لە ئەمریکا لە ٢٢ هەزار کەس یەکێک بەر مین دەکەوێت. ئاوارە بوون و کۆچکردن شتێکی زۆر ترسناکە بۆ بەرکەوتنی مین. کاتێک شەڕ رادەوەستێت خەڵک دەگەڕێتەوە زۆر لەو خەڵکە دووچاری کێشەی مین دەبن. زیادبوونێکی زۆر بەدیار دەکەوێت لە ژمارەی قوربانییەکانی مین کاتێک کۆچکردن روودەدات لە زۆربەی وڵاتەکان. ١٩٩٢ کۆچبەرەکانی باشووری رۆژهەڵاتی ئەفغانستان لە نەخۆشخانەکانی (پیشاور و جەلال ئاباد) لەسەر سنووری پاکستان رێژەی ٨٣٪ لە نەخۆشخانەکانی ICRC ژمارەیان زیاتر بوو لە ساڵەکانی پێشتر لەم ناوچەیە.

## هۆکاری ئابووری و کۆمەڵایەتی

مین بەچەکێکی کۆکوژی دادەنرێت، بەبزووتنەوەیەکی لەسەرخۆ مین کاریگەریەکی گەورە و ترسناکی هەیە بۆ سەر کۆمەڵگا. زۆربەی زۆری ئەو وڵاتانەی دووچاری کێشەی مین هاتوونە وڵاتی هەژار و وڵاتی تازە گەشەسەندوون. کە سەرچاوەیەکی کەمیان هەیە بۆ ئەوەی بەرەنگاری ناکامەکانی ئەم کێشەیە ببنەوە، تاوەکو دوای ئەوەی جەنگیش نەما، مین بەردەوام دەبێت بۆ لەناوبردنی خەڵک و کاریگەری راستەوخۆ و ناڕاستەوخۆی هەر دەبێت. ئاوەدانکردنەوە و جێگیربوونی خەڵک لەو ناوچانە وا دەکات بۆ چەند ماوەیەک هەردەم کۆمەڵگا قەرەبووی ئەم کێشەیە دەکات دوا بەدوای یەکدا بڵاوبوونەوەی کێڵگەی مین ئابووری وڵات بەرەو ئیفلیج بوون دەبات. مینی دژە کەس ئاکامی ناڕاستەوخۆی هەیە بۆ پەرەسەندنی وڵات و پێکهاتەی کۆمەڵگا دەڕووخێنێ، لە چەند حاڵاتێکیشدا کشتوکاڵ و جووڵەی گواستنەوە لەسەرخۆ و کەم دەکات تاوەکو دەوەستێت، مین وا دەکات کە چاکبوونەوەی هێڵی شەمەندەفەر و وێستگەی کارەبا و بۆڕی ئاو دوا بکەوێت و لەسەرخۆ و بێ بەها ببێت، کاریگەریەکی زۆر بەهێزی دەبێت لەسەر بازاڕی ناوخۆ، چونکە بەنەگەڕانەوەی خەڵک بۆ سەر زەوی و کێڵگەکانیان



خراپی بەکارهێنانی مین

بازاڕی ناوەخۆ بەرەو هەڵسان و گرانی دەبات، نرخ بەرز دەبێتەوە و کرێکار داوای کرێی زیاتر دەکات. ئەو پارە زۆرەی کە مین دەیەوێت بۆ هەڵگرتنەوەی هەموو ئەو مەخزوونەی حکومەت هەڵیگرتووە دەیبات.

لە وڵاتی لیبیا بەپێی لێکۆڵینەوەی نەتەوە یەکگرتووەکان نزیکەی ٢٥ ٪ ئەو زەوییانە کە بۆ کشتوکاڵ بەکاردێت بەکار ناهێنرێت، چونکە ئەم زەوییانە تاوەکو ئێستا کێڵگەی مینی تێدایە ئەم کێڵگانە بۆ شەڕی دووەمی جیهانی دەگەڕێتەوە پێش ٥٠ ساڵ روویداوە.

له سۆماڵیش کێڵگەی مین زۆرە کە زۆربەی ئەم کێڵگانە لە باشووری وڵاتە(*).

مەڕومالاّت و سەرچاوەی ئاو لەم وڵاتە بەسەختی مین ڕێژکرا، بەخێوکردنی مەڕ زۆر کاریگەربوو بەو کێڵگە مینانە گەیشتە ئەو ڕێژەی کە چوونە دەرەوەی مەڕ بۆ یەمەن و سعودیەی عەرەبی وەستا. چاندنی مین زۆربوو وای کرد گرانی پەیدا بکات فەردەیەک لە گەنم و جۆ بەڕێژەی ٢٥٪ زیاد بێت چونکە ڕێگاکان مینڕێژ کران ئەوەش بووە هۆی ئەوەی هاتوچۆ کەم بێتەوە.

لە ئەفغانستانیش خواردن بەڕێژەیەکی زۆر گران بوو لە ساڵی ١٩٩٢ لە ٥٢٢ لا ڕێگاکانی ئەم ناوچەیە مینیان دۆزیەوە زۆربەشیان تاوەکو ئێستا پاک نەکراوەتەوە. گەورەترین بەنداو لە ئەفغانستان (کاجاکی)یە تاوەکو ئێستا کارەبای تولید نەکردووە بەهۆی ئەوەی ئەو بەنداوە زۆر بەسەختی مینڕێژکراوە ئەو تاوەرە کارەبایانەی (خطوط الضغط العالي) کە بەنداوی (قەندەهار) بەبەنداوی (ساروبی) لە کابول بەیەک دەبەستێتەوە ئەوانیش هەمووی مینڕێژکرا.

---

(*) زۆربەی زۆری مین لە سۆماڵ لە باشووری وڵاتە، ئەو مینانەش سەربازانی وڵات دەیانچاند بەئەنقەست لەو شوێنانەیان دادەنا کە خەڵکی تێدا دادەنیشتن، تاوەکو ژیانی ئەو عەشایرانە تێک بدات کە یارمەتی بەرهەڵستکارەکانیان دەدا کە دژی حکوومەت بوون.



قوربانییەکی مین

چەند تاوەرێک لەو تاوەرانە کە لە نزیکی بەندەری ساروبییە خاوێن کران لە مین بەڵام زۆربەی زۆری تاوەکو ئێستاش هەر ماوە.

بەڵام لە کوردستانی عێراق بەگوێرەی لێکۆڵینەوەکانی نەتەوە یەکگرتووەکان بەرێژەی ١٧٪ ئەو زەویانە کە بۆ کشتوکاڵی دەست دەدەن مینیان تێدایە ئەو رێژەیەش لە ناوچە سنووریەکان بۆ ٥٠٪ دەچێت.

لە ساڵی ١٩٩٥ لێکۆڵینەوەی (CLET) لە ئەفغانستان، بۆسنە، کەمبۆدیا و مۆزەمبیق ئەوەبوو لەنێوان ٢٥٪ بۆ ٨٧٪ ژیانی خەڵکی ئەو ناوچەیە کاریگەربوو بەکێڵگەی مین ئەگەر مین نەمێنێ ئەوە بەرهەمی کشتوکاڵی لە ٨٨٪ بۆ ٢٠٠٪ لە چەند ناوچەیەکی ئەفغانستان چاک دەبێت، ١١٪ لە

بۆسنە ٣٥ ٪ لە کەمبۆدیا ٣,٦ ٪ لە مۆزەمبیق. ئەو خێزانانەی کە مەترسی مینیان هەیە ٤٠ ٪ زۆر بەزەحمەتی دەتوانن خواردن پەیدا بکەن.

لە ئەفغانستان ٧ ٪ ئەو خێزانانە لە لێکۆڵینەوەیەکدا وتیان ئێمە ناچارین جێگای خۆمان بگوازینەوە، چونکە نەمانتوانیوە لە ناوچەکانی خۆمان نان بۆ خۆمان پەیدا بکەین، هەروەها بەرێژەی ٢٢ ٪ لە کەمبۆدیا و ٢ ٪ لە مۆزەمبیق خێزانەکان هەمان گرفتیان هەیە.

لە لێکۆڵینەوەیەک لە ساڵی ١٩٩٥ لە هەرێمی (جیولین) لە وڵاتی ڤێتنام رێژەی خەڵکەکە لەم ناوچەیە دەگاتە ٦٣ هەزار کەس بینرا لەو هەرێمە لەنێوان ٣٠٠٠ تا ٤٠٠٠ هیکتار لە زەوی کشتوکاڵی ناتوانن کشتوکاڵی تێدا بکەن و بچێنن لەبەر مەترسییەکانی مین و تەقەمەنی تەقێندراو و نەتەقێندراو. ئەوەی دەزانرێت لە ڤێتنام رێژەی بەرهەمی کشتوکاڵی زۆر بەرزە هەر هێکتارێک نزیکەی دوو خێزانی ٥ کەسی بەخێو دەکات، ئینجا ئەو زەوییە کشتوکاڵیانە کە لەو هەرێمە مینرێژ کراون توانای ئەوەیان هەیە لەو زەوییانەی کە کاری کشتوکاڵی تێدا ناکرێ ٣٥ هەزار کەس بەخێو بکات، بەڵام بەپێچەوانەوە ئەم خەڵکانە تووشی هەژاری و نەداری بووینە بەهۆی شەرێک رووی دا پێش ئەوەی ئەوان لە دایک بن، سەرەڕای ئەوەش ئەو هەرێمە هەموویان داهاتیان کەمە چونکە ئەم

زەوییـــانە بەکـــار نایەن، بۆ پاککردنەوەی ئەم ناوچانەش پێـویسـتی بە ١٧,٥ ملیـۆن دولاری ئەمـریکایی هەیە ئەمـەش زۆر زەحـمـەتە چونکە ئەو پارەیە نییە بۆ پاککردنەوەی ئەو مینانە.

مین وا دەکات کۆچبەرەکان نەگەڕێنەوە بۆ سەر ماڵ و حاڵی خۆیان، نەک هەر ئەوەندەش بەڵکو مین وا دەکات خەڵکی ماڵی خۆی بەجێ بهێڵێت، جگە لەمەش کۆچبەرەکان ژیانیان دەکەوێتە بەر مەترسی، لەگەڵ ئەوەش گەڕانەوەی خەڵک و ئاوەدانکردنەوەی ناوچەکان دوا دەخات. کۆچبەرەکان دەبێ چاوەڕوانی ئەوە بکەن رێ و شـوێنیـان پاک بکرێتـەوە لە مین سەرەڕای ئەوەش کە دەگەڕێنەوە دەبینی مین هەیە، هەر لەبەرئەوەشە ناتوانن کارەکانیـان بەڕێوەببەن و کشتوکاڵی و لەوەڕ بکەن.

نووسـینگەی نەتەوە یەکگرتووەکـان ناچاربوو لە سـاڵی ١٩٩٣ لە کەمبۆدیا پرۆگرامی خۆی کەم بکاتەوە کە تەرخـان کـرابوو بۆ پاسـەوانی ئەو زەوییانەی بۆ ئەوانەی دەگەڕێنەوە لەبەر بوونی مین چونکە نزیکەی ٣٧٠ هەزار لە خـەڵکی ئەو وڵاتە تووشی بێ ماڵی و دەربەدەربوون.

لێکۆڵینەوەیەکی (UNHCR) لە سـاڵی ١٩٩٢ بینی زۆربەی زۆری کۆچبەرە ئەفغانییەکان هەر لە پاکستان ژیان بەسەر دەبەن، ئەم خەڵکە کۆچبەرە و دەربەدەرەش لەبەرئەوە ناگـەڕێنەوە چونکە مین هەڕەشەی مەرگیان لێ دەکات.

مین زۆر بەئاسانی لە هەموو شوێنێک دەچێندرێ ماوەیەکی زۆریش دەمێنێ لە دوای ئەوەی کاری سەربازی تەواو دەکات بۆ چەندەها ساڵ ئاو، کەناری دەریا، پارک، بیابان، چیا و کێڵگەکان ئەوانە هەموو مینی دیاری نەکراوی تێدایە و دەمینێ.

کێڵگەی مین وا دەکات کەوا پاڵەپەستۆیەکی بێ شومار لەسەر دانیشتوان زیاد بێت لەو شوێنانەش زۆربێت کە چڕی دانیشتوانی هەیە. کاتێک مین جێگای کشتوکاڵی و لەوەڕاندنی مەڕوماڵات دەخاتە مەترسی خەڵکەکە ناچار دەبێت بچنە ناو شارەکان ئەوەش بێ گومان پاڵەپەستۆی دانیشتوان دروست دەکات دەبێتە هۆی بێ کاری و گیروگرفتی تر.

لە باشووری ئەفریقیا کێڵگەی مین چەند ئەنجامی ژینگەی ترسناکی هەیە لە چەند ناوچەیەک کێڵگەی مین بۆتە بڵاوبوونەوەی (مێشی تسی تسی) کە ئەو مێشەش نەخۆشی نوستن بڵاودەکاتەوە و هەروەها ئەو کێڵگە مینانە دەبنە هۆی بڵاوبوونەوەی (نەخۆشی مەلاریا).

لە ئەنگۆلا مین لەلایەن دزەکان بەکاردێت لە باخچەی نیشتمانی (مویا) بەکاری دەهێنن بۆ کوشتنی فیل. لە زیمبابوێ ٩ هەزار ئاژەڵ بەکێڵگەی مین گیانیان لە دەست داوە لە ساڵی ١٩٨٠ چێڵ سەرچاوەیەکی گرنگی خێزانەکانی ئەو وڵاتە بوو دەورێکی گرنگی کۆمەڵایەتی و ئابووری هەبوو.

بەپێی ئەو لێکۆڵینەوەی هوشیارکردنەوەی ICRC

له ساڵی ١٩٩٦ ئەو کەسانەی کە زۆر دووچاری مین دەبن لە بۆسنە ئەوانەن کە لە کێڵگەکان کار دەکەن بەتایبەتی پیاوەکان.

## هوشیارکردنەوە لە مین

چالاکی هوشیارکردنەوە لە مین ئەو چالاکییەیە کە کاریگەریەتی خێرایی هەیە بۆ کەمکردنەوەی زیانێ کە کێلگە مینەکان دروستی دەکەن لەو وڵاتانەی کە دووچاری کێشەی مین هاتوونە. باشترین ڕێگاش بۆ چارەسەرکردنی ئەم کێشەیە فێربوونی بەهاناچوونی بەرایی (اسعاف اولی)یە بۆ ئەو کەسانەی کە بەر مین دەکەون، ئەم ڕێگایەش سەلماندی کەوا توانای هەیە بۆ کەمکردنەوەی ڕێژەی برینداربوون و مردنی مرۆڤ بەهۆی مینەوە.

پرۆگرامەکانی هوشیارکردنەوە لە مین زۆرن، بەڵام ئامانجی سەرەکی بۆ ئەم کارە هەمووی ئەوەیە کە چۆن خەڵک فێر بکەن خۆیان لە مین و تەقەمەنی بپارێزن. نامەی سەرەکی بۆ ئەم کارە ئاسانە (نزیکی کێڵگەی مین مەبە و دەستکاری مەکە). ئەوانەی کە لە تیمەکانی هوشیارکردنەوە کاردەکەن دەبێ بزانن چ جۆرە مینێک بەکارهاتووە لە هەر پارچە زەوییەک خەڵک لەم شتە ئاگادار بکاتەوە هەروەها دەبێت ڕەچاوی نەریتە کۆمەڵایەتییەکانی ناوەخۆ بکەن. دەبێت خەڵک فێر بکەن چۆن کێڵگەی مین بناسنەوە و چۆن مین دەتەقێ و ئاکامەکانی چییە؟ نیشانەی مینەکان فێرە خەڵک بکەن چۆن مین دەناسرێتەوە؟ ئەم نیشانانەش ئاشکرایە هەروەها فێر بکرێت هەڵسوکەوتیان چۆن بێت لەو شوێنانەی کە تووشی



یەکێک لە ئەندامانی ڕێکخراوی (KOMA)
هەولێر. لەکاتی هوشیارکردنەوە

مین هاتوون زۆر جەختیان لەسەر دەکرێت کە نیشانەیەک دابنێن بۆ مین و کێڵگە مینەکە. هەروەها خەڵکەکە فێر دەکرێت جوان ئاگەداری خەڵک بکەنەوە. زۆر دڵنیابن کەوا تیمی پاککەرەوە کە پلانی ئامادە دەکات بۆ پاککردنەوەی مین. ئەم تیمانە زۆر سوود لەم ئاگەداری و ڕاپۆرتانە وەردەگرن کە لەلایەن خەڵکی ناوچەکە بۆیان دەچێت، ئەوانە هەمووی ئەم خاڵە گرنگانەیە بۆ چالاکی هوشیارکردنەوە، چونکە ڕووداوی مین لەو شوێنانە ڕوودەدات کە دوورن لە مەڵبەندی تەندروستی و نەخۆشخانە، بۆیە پێویستە مەشقی بەهاناچوونی بەرایی لەو شوێنانە بەخەڵک بکرێت.

ICRC چەند پرۆگرامێکی هوشیارکردنەوەی هەیە لەو چەند وڵاتەی کە تووشی مین هاتوون، ئەوەش تەمویلی پرۆگرامی هوشیارکردنەوەی چەند ڕێکخراوێکی ناوەخۆ دەگرێتەوە، یان بڵاوکردنەوەی پۆستەر لەناو کیسەی گەنم و جۆ بۆ جووتیارەکان تاوەکو دەگاتە کارێکی ڕاگەیاندنی بەربڵاو، تیمەکانی هوشیارکردنەوە لە مین لە قوتابخانە و گوند و شارەکان کاردەکەن.

پرۆگرامی هوشیارکردنەوەش لە مین و تەقەمەنی جگە لە نەتەوە یەکگرتووەکان لەلایەن چەند ڕێکخراوێکی دیکەی NGO (*) دەکرێت، لەوانە NPA و MAG وەهەروەها ڕێکخراوی خاچی سوور و مانگی سووری ناوەخۆ ئەمانە هەموویان پرۆگرامی هوشیارکردنەوە لە مین پێشکەش دەکەن لەو وڵاتانەی کە تووشی مین هاتوون.

---

(*) NGO: ڕێکخراوی ناحکومییە و NPA ڕێکخراوی یارمەتی خەڵکی نەرویجە، MAG ڕێکخراوی کۆمەڵەی ئامۆژگاری مینە، ئەم دوو ڕێکخراوە خێرخوازانە مەبەستیان ئەوەیە کێشەی مین لە جیهان کەم بکەنەوە، بەتایبەتیش لە زۆربەی زۆری ئەو وڵاتانە دا کە بەدەست کێشەی مینەوە دەناڵێنن بۆیە ئەو ڕێکخراوانە لەو وڵاتانەدا بوونیان هەیە.

## سەرچاوەی مین لە کوردستان

ئەگەر بەوردی لە مێژووی میللەتی کورد و هەڵدانەوەی لاپەڕەکانی بزاڤی رزگاریخوازی گەلەکەمان نزیک ببینەوە رووبەڕووی زۆر کارەساتی جەرگبڕ و ماڵوێرانی و سەخت و دژوارمان دەکاتەوە، ئەم لاپەڕانە ئەگەرچی قارەمانییەتی و جەسارەتی کورد دژی داگیرکەرانی وڵات نیشان دەدات، لە هەمان کاتیش کاولی و ماڵوێرانی بەدواهاتووە، لەم ئاسەوار و نیشانە ناشرینانەش کە دوژمنانی گەلەکەمان بۆ ئێمەی بەجێ هێشتووە (مین)ە.

ئەگەرچی رژێمی عێراقی زۆر ئاسەواری ناشرینی بۆمان بەجێ هێشتووە، بەڵام مین بەرچاوترین و سەختترین کێشەیە کە تاوەکو ئێستا پێوەی دەناڵێنین.

ئەوەتە بۆ هەر لایەکی ئەم وڵاتە دەڕۆییت مەرگ چاوەڕێتە، لەنێو هەر شاخێک و چیا و قەدپاڵ و لاپاڵێکی ئەم وڵاتە، لەنێو هەر دەشت و کەنار و رووبارێکی ئەم کوردستانە چەندان تەلبەندی دڕکاوی دروست کراوە، هێمای مەرگ لە تەنیشتییانەوە خۆی مەڵاس داوە. مینە جۆراوجۆرەکانی ئەم خاکە چاوەڕوانی دەست و قاچی تۆلازی کورد و منداڵی کوردە، بۆ ئەوەی بگەنە سەری و بیان تەقێنەوە. ئەو مەرگە دەماودەمە تاوەکو ئێستا لە کوردستان هەر ماوە و هەر دەمێنێ، دوژمنانی گەل و دوژمنانی

مرۆڤی کورد لە جیاتی گوڵ و نەمام لە کوردستان بچێنن! مین و تەقەمنیان بۆ چاندووین.

بۆ هەرلایەکی ئەم وڵاتە دەڕۆییت هێمایەکی مین قوت کراوەتەوە، مەرگی ناکاومان پیشان دەدات بەدەست و قاچ قرتاندن سڵاومان لێ دەکات. مین بۆتە سەرچاوەیەکی گرنگی لەناوبردنی مرۆڤ، ئەو وڵاتانەی کە بوونەتە مەیدانی شەڕ، زۆرترین کات گیرۆدەی ئەو سەرچاوە خەتەرناکەن، کە تەنها بۆ پەککەوتن و لەناوبردنی مرۆڤ دروست کراوە، لە کوردستانی خۆشمان چەندان کەس بەهۆی مینەوە پەکیان کەوتووە، یاخود ئەو مینە لەناوی بردوون، چەندین ساڵە گەنج و منداڵی کورد بەو هۆیەوە مینەوە گیانیان لە دەست دەدەن و دەبنە قوربانی.

## شەپۆلی مینڕێژکردنی کوردستان

خاکی کوردستان مینێکی زۆری لێ چاندراوە، دەکرێ لێرە ئەم شەپۆلە مینانە باس بکەم کە کوردستان بەهۆیانەوە مین ڕێژکراوە.

شەپۆلی یەکەم بۆ مینڕێژکردنی خاکی کوردستان لە ساڵی ١٩٦٠ دەستی پێکردووە لەگەڵ سەرهەڵدانی شۆڕشی ئەیلول لەلایەن حکوومەتی عێراقییەوە، کۆنترین مینیش کە لە کێڵگە مینڕێژکراوەکانی کوردستان دەدۆزرێتەوە ئەوە پیشان دەدات کە ئەو مینانە لە کۆتایی شەستەکان و سەرەتای حەفتاکان چاندراون، لەو ماوەیەشدا شۆڕش بەگەرمی سەری هەڵدا، ئەم مینانەش ئێستا زۆر جێگای مەترسین چونکە کۆن بووینە، بۆیان هەیە بەبچووکترین جووڵانەوەیەک بتەقنەوە.

مەبەستی چاندنی ئەو مینانەش بۆ کوژاندنەوەی کڵپەی شۆڕشی ئازادیخوازی بووە لەم ناوچانەدا، چونکە شۆڕش لەو کاتە لە گەرمەی دەست پێکردنی بوو، شۆڕشگێڕەکان چالاکی جۆراوجۆری پارتیزانی دەنوێن و جێنشین دەبن و دەبێتە شوێن پێیان، بەڵێ ئەمەی کرد و گشت شوێنەکانی مینڕێژکرد، لە هەموو کونج و کەلەبەرێک لەژێر بەرد و دارێک مینێکی چاند، بۆ ئەوەی پێشمەرگە نەتوانێت خەباتی خۆی لەم ناوچانە بکات، چەندین پێشمەرگە بەهۆی مینەوە لەم ناوچانە گیانیان لە دەست دا و تووشی



مین لەناو دۆڵ و ڕووبارەکان

پەککەوتەیی هاتن.

دووەم گەورە شەپۆلی مین ڕێژکردنی کوردستان لە ماوەی شەڕی یەکەمی کەنداو بوو، شەڕی نێوان عێراق و ئێران بوو کە ئەم شەڕەش هەشت ساڵی خایاند و لەم ماوەیەشدا کوردستان بووە جێگایەکی هەڕەشە لێکراو بۆ گەلەکەمان، چونکە گۆڕەپانی شەڕی ئەم دوو دەوڵەتە شەڕکەرە بوو، ئەو ماوەیەش بەهەردوو وڵاتەوە زۆرترین مینیان لە خاکی کوردستان چاند، بەتایبەتیش لە ناوچە سەر سنوورییەکان دا، ژمارەی ئەو مینانەش بە ملیۆنان دەبێت لەناوچەکانی وەکو حاجی ئۆمەران و چۆمان و سیدەکان، هەروەها لە ناوچەکانی دەوروبەری شاری سلێمانی وەکو قەلادزێ و هەتاوەکو دەچینە خواری بۆ پێنجوین و ناوچەی هەڵەبجە و ناوچە سەر

سنووریەکانی تر.

خــەڵکی هەردوو وڵات تووشی مــەرگــەســات و مەینەتی و گیان لە دەستدان و سەرگەردانی هاتن، هەردوو وڵات بۆ داکــۆکــیکردن لە خــاکی خــۆیان و تێکشکاندنی هێــرشی بەرامــبــەر هەمــوو جــۆرە چەکێکیان بەکارهێنا، رژێمی سەدام هاوکات لەگەڵ ئەو شــەڕەدا گــورزی کــوشندەی لە کــورد دەوەشــاند تەنانەت چەکی کــیــمــیــاوی کــۆکــوژ و ژەهراوی دژی کــورد بەکــارهێنا کــە بــووە هۆی ئەوەی چەندین هەزار کەسی خــەڵکی بێ گــونــاه و بێ تاوان لە کــوردســتــان کــیــمــیــاباران بکرێت لەنێو ئەم چەند ساڵەی شەڕدا، بەبیــانووی بەرگــری کــردن لە وڵات بوونە قــوربانی و سووتەمەنی شەڕ.

تەواوبــوونی شــەڕی نێــوان عــێــراق و ئێــرانیش ئاشکرابوو کە کونج و کەلەبەر نەماوە گوند و شاخ و دۆڵ و کــێــو نەمــاوە مــینــڕێــژ نەکــرابێت، بەمــەبەســتی بەرگــری کــردن لە هــێــرشی دوژمــنايەتی بەرامــبــەر بەیەکــتــری بەتــایــبــەتی ئەو شــوێنانەی کــەوتونەتە سەرسنووری هەردوو وڵات.

سێــیــەم شەپۆلیش شەڕی دووەمی کــەنداوە بەهۆی ئەم شــەڕەشــەوە ژمــارەیەکی زۆر مــین لەســەر سنووری عێراق و تورکــیــا دانران بۆ ئەوەی ببێــتــە بەربەســتــێــک لەســـەر رێگای لەشکری حکوومــەتە هاوپەیمانەکــان دژی عــێــراق لە ســاڵی ١٩٩٠-١٩٩١، بەتــایــبــەت ساڵی ١٩٩١ کە هێرشە وشکانییەکی هاوپەیمانان

دەستی پێکرد، ئەو ناوچەیەش کە مین ڕێژکراوە بەتایبەت لە ئیبراهیم خەلیل و نێوان فیشخابور و هەتاوەکو سنووری سوریا دەگرێتەوە، بەدرێژایی ٢٠ تا ٢٢ کیلۆمەتر مینرێژ کراوە. زۆربەی ئەم مینانەش بەتایبەتی کە لەم ناوچەیە دانراون مینی دژی تانکن.

چوارەم شەپۆلی مینیش لە مانگی نیسانی ساڵی ٢٠٠٣ پێش دەستپێکردنی ئۆپراسیۆنی ئازادی عێراقە، هێزەکانی ڕژێم لە کاتی پاشەکشەکردنیاندا لە زۆربەی ناوچەکانی کوردستان، مینێکی زۆریان چاند بۆ ئەوەی ئەو مینانە هەڕەشە لە دانیشتوانی ناوچەکە بکەن و ببنە بەربەستێک لەبەردەم هێرشی هاوپەیمانان، زۆربەی ناوچەکانیش کە مینڕێژی کردن ناوچەکانی هێڵی تەماسی شەڕ بوو، کە هەموو ناوچەکانی کوردستانی لەخۆی گرتبووەوە ئەو مینانەی کە چاندیشی زۆربەیان مینی دژە تانک و مینی ڤاڵمارای بوون کە مینێکی زۆر خەتەرناکن بۆ مرۆڤ هەروەها مینی PMN کە مینی دژە کەسن و زۆر مەترسیدارن.

## ژماره و ڕووبەری مینڕێژکراوی کوردستان

ئەوەی جێگەی ئاماژە پێ کردنە تاوەکو ئێستا نە UN و نە NGO یەکانی نێودەوڵەتی، هەروەها خودی حکوومەتی هەرێمیش، نەیانتوانیوە بە وردی بەراوردی ئەوە بکەن تا چ ڕادەیەک کوردستان مین ڕێژکراوە؟ گومانی تێدا نییە هەرێمی کوردستانی عێراق بەیەکێک لەو هەرێمانە دادەنرێت لە جیهاندا کە ژمارەیەکی زۆر مینی تێدا چاندراوە. واش مەزەندە دەکرێت کە نزیکەی ٢٠ ملیۆن مین لە کوردستان چێندراوە، بەڵام ئێستا ١٠ تا وەکو ١٢ ملێون مین لە کوردستان دا ماوە کە ئەمەش نزیکەی ٣٥٠٠ کێڵگەی مینڕێژکراو دەگرێتەوە، ئەم کێڵگانەش ٥٠٠ مەتری چوار گۆشە لە خاکی کوردستانی عێراق لەخۆ دەگرێت و زۆربەیان زەوی کشتوکاڵی و شوێنی لەوەڕاندی ئاژەڵە و ئەو زەویانەش لەخۆ دەگرێتە کە بۆ دروست کردنی خانووبەرە بەکاردێت، هەر ئەمەشە ڕێگا لە ئاوەدانکردنەوەی کوردستان و گەشەسەندنی ئابووریی کوردستان دەگرێت.

ژمارەی گشتی گوندەکانی کوردستان زیاتر لە ٤ هەزار گوند دەبێت، بەگوێرەی ڕاپۆرتێک کە بەم دواییانە لە UN ەوە بڵاوکرایەوە، بەدیار دەکەوێت کە نزیکەی ١١٠٠ گوند لە کوردستان بەدەست کێشەی مینەوە دەناڵێنن، واتە کێشەی مینیان

هەیە. ئەمەش کاردەکاتە سەر ژیانی گوندنیشینەکان
کە ژمارەیان دەگاتە نزیکەی ٧٥٠ هەزار کەس
لەوانەی لە نزیک کێڵگەکان دەژین لە کۆی ٦٠٠،
٣ ملێون کەس لە کوردستاندا، کە نزیکەی یەک لە
سەر پێنجی دانیشتوانی کوردستان پێک دێن،
ئەمەش وا دەردەخات کە مین چ مەترسییەکی هەیە
بۆ سەر کۆمەڵگای کوردەواری، بەتایبەتی لە ناوچە
لادێییەکان و بۆ گوندنیشینەکان.

هەروەها شتێکی تر لەم راپۆرتەی UN دا
باسکراوە ئەویش ئەوەیە، لەکاتێکدا رژێمی عێراق
لە کوردستاندا ٢٥ قەزای لەبەر دەست دابوو، ٢٤
لەم قەزایانە هەر هیچ نەبێت چەند کێڵگە مینێکیان
تێدا دەدۆزرێتەوە، واتە یەک قەزا لەو کاتە لە
کوردستان کێشەی مینی تێدا نەبوو. ئەگەر بەم
رادەیەش مین هەبێت ئەوا قوربانی زۆر دەبێت. ئامار
و ئەرقامیش ئەگەر هەبێت لەساڵی١٩٩٧-١٩٩٨،
لەو کاتەوە UN دەست بەکاربووە بەرێکوپێکی
مانگانە ئاماری هەبووە بەڵام ئەوەی تر هەمووی
مەزەندەیە، هەروەکو زانراویشە ژمارەی هەرە زۆری
قوربانیانی مین لە سەرەتای ساڵی ١٩٩١ بووە.

## جۆری مینەکان لە کوردستان

ئەو مینانەی تاوەکو ئێستا لە کوردستان دۆزراونەتەوە گەلێک جۆرن کە خۆی لە سەرەوەی (٢٠) جۆر دەدات. مینیش خۆی لە خۆیدا دوو جۆرە:

یەکەم:

مینی دژی کەس: ئەم مینەش بۆ بریندار کردن و کوشتنی خەڵک دروستکراوە ئەمەشیان دووجۆرە:
مینی کلّپەدار: ئەو جۆرە مینەیە لە کاتی تەقینەوە گڕوکلّپەی لێ دەردەچێ بەهۆی پاڵەپەستۆ خستنە سەر بەدەست یا بەپێ. نموونەی ئەم مینەش زۆرن وەکو:

(تی ئێس ٥٠، ڤی ئێس ٥٠، پی ئێم ئێن، ئێس بی ٣٣، تایپ ٧٢، ڤار ٤٠، ئێم ١٤، پی ئێم دی ٦).

مینی ساچمەدار: ئەو جۆرە مینەیە لە کاتی تەقینەوە ساچمە و پارچەی لێ دەردچێت، بەشێوەیەکی وا دروست کراوە کە زیانێکی زۆر بەمرۆڤ دەگەیەنێت، جا چ بەسەختی برینداری بکات یان بیکوژێت. بەجۆرێک دروست کراوە ئەو شوێنە کە مینەکەی تێدا حەشاردراوە زیان بەزۆرترین خەڵک بگەیەنێ، ئەم جۆرەشیان نموونەی زۆرە لە کوردستان وەکو: ( ڤالمارا ٦٩- ئێم ١٦- پۆم زێد- پرۆم ١- ئێم ٨).



بەکارهێنانی مین بەخراپی وەک یاریی منداڵان

دووەم:

مینی دژی تانکە کە قەبارەکەی لە مینی دژەکەسی گــەورەترە بۆ لە ناوبردنی تانک و زریپــۆش و ئۆتومبێل و تراکتۆر و دەراسە و هتد... دروستکراوە نموونەی ئەم مینانەش:

(ڤی ئیس١،٦- ٢،٣- ئێم ١٩- تی سی ٢،٤- ڤی ئێم ٤٦). زۆربەی ئەم مینانەی لە لایەن ئیتالیا و یەکێتی سۆڤیەتی پێشوو و چین و سوید و ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا و ئیسرائیل و

یوگوسلافیای پێشوو دروستکراوەن.

ئەمەش هەندێ لەو مینانەیە کە لەکوردستان دۆزراونەتەوە:

١- ڤالمارا (ڤی 69): شوێنی دروستکردنی: ئیتاڵیا، تیرەکەی ١٠٤ ملیمەترە، بەرزییەکەی ٢٠١ ملیمەترە، کێشەکەی ٣,٣ کغم، بڕی مادەی تەقەمەنی ٠,٥٧٦ گرام (TNT RDX)، مادەی قاووغ پلاستیک، ڕەنگی خامییە، شێوازی تەقینەوەی: بەهۆی گوشار یان تەلی سەرسمک پێکەوە مەودای ٥٠ مەترە، شێوازەکانی دۆزینەوەی بەئاسانی دەدۆزرێتەوە، چونکە چەند تێلێکی لێ بەرزبۆتەوە (ژ١. UN).

٢- (ڤی ئێس- ٥٠) شوێنی دروستکردنی ئیتاڵیا، تیرەکەی ٩٠ ملیمەتر، بەرزییەکەی ٤٥ ملیمەتر، کێشەکەی ٥٠گرام، مادەی قاووغ پلاستیک، ڕەنگی زەیتوونی کاڵ، قاوەیی کاڵ، شێوازی تەقینەوەی بەهۆی گوشاری ٢٠ مەترە، شێوازی دۆزینەوەی زەحمەتە، ئەم جۆرە مینە بەئامرازی مین دۆزەرەوەی کانزایی دەستی دەدۆزرێتەوە (پلێتی گوشار بەکانزایەکی ناموگناتیزی داپۆشراوە.). (ژ٢. UN)

٣- (تی ئێس- ٥٠): تیرەکەی ٩٠ ملیمەترە، بەرزییەکەی ٤٥ ملیمەتر، کێشەکەی ١٨٦ گرام، بڕی مادەی تەقەمەنی ٤٣گرام، ماددەی قاووغ پلاستێک، ڕەنگی زەیتوونی کاڵ یا قاوەیی کاڵ،

گوشار، ٢٥م، شێوەی دۆزینەوەی سەختە، بەهۆی ئامرازی مین دۆزەرەوەی کانزایی دەدۆزێتەوە (ژ ٣ UN)

٤- (پی ئێم ئێن): تیرەکەی ١١٠ ملم، بەرزییەکەی ٥٣ ملم، کێشەکەی ٥٥٠ گرام، بڕی مادەی تەقەمەنی ٢٤٠گرام TNT، ٩ گرام مادەی تیترێلی خێراکەر، مادەی قاووغ پلاستیک، لاستیک، کانزا، ڕەنگی قاوەیی و ڕەش، شێوازی تەقینەوەی بەهۆی پەستانی پارچە میکانیکییەکانی ناوەوە و درەنگ تەقاندنەوەی، مەودای مەترسی ٣٢٥، شێوازی دۆزینەوەی بەئاسانی دەدۆزرێتەوە چونکە بڕێکی زۆر کانزا لەناو فیوزی تەقینەوەکەیدا هەیە (ژ٤ UN)

٥- ئێم ١٤(M14): تیرەکەی ٥٦ملم، بەرزییەکەی ٤٠ملم، کێشەکەی ٩٩گرام، بڕی مادەی تەقەمەنی ٢٩گرام، مادەی قاووغ پلاستیک، ڕەنگی زەیتوونی و سەوزی تۆخ، شێوازی تەقینەوەی بەهۆی پەستانە، مەودای مەترسی ٢٥م، زۆر بەزەحمەت دەدۆزرێتەوە بەهۆی ئامرازی کانزا دۆزەرەوە. (ژ٦ UN)

٧- (ڤی- ئێس- تی): تیرەکەی ٧٠ ملم، بەرزییەکەی ١٩٧ ملم، کێشەکەی ٥١٠ گرام، مادەی قاووغ پلاستیک، ڕەنگی زەیتوونی تۆخ، شێوازی تەقینەوەی بەهۆی پەستان و ڕاکێشان، تەلی دانرایەوە، مەودای مەترسی ٢مەتر، شێوازی

دۆزینەوەی بەچاو دەبینرێت ئەم جۆرە مینە بۆ ڕۆشنکردنەوە بەکاردێت (ژ٧ UN)

٨- پۆمز تو ئێم (POMZ2M): شوێنی دروستکردنی ڕووسیا، تیرەکەی ٧٨ملم، بەرزییەکەی ١٠٧ملم، کێشەکەی ١٢٠٠گرام، بڕی مادەی تەقەمەنی ٧٥ گرام، مادەی قاووغ ئاسنی داڕێژراو، ڕەنگی سەوز، زەیتوونی، شێوازی تەقینەوەی بەڕاکێشان، مەودای مەترسی٥٠مەتر، شێوازی دۆزینەوەی بەچاو دەبینرێت (تەلی سەرسمک پێکەوتوو) ئەم جۆرە مینە دژەکەسییە و لەکاتی تەقینەوە پارچەکانی تەڵەسماوی دەبێت: (ژ٨ UN)

## دۆزینەوەی شوێنی مینەکان کە لە کوردستاندا

ئەو شـوێنانەی کـە مـینیـان تێدا دۆزراوەتەوە لە کوردسـتـان زۆر دیار و بەرچاون، زۆربەیان ئێسـتـا لەلایەن رێکخـراوە بیـانییـە خـێـرخـوازەکـان یاخـود لەلایەن رێکخراوە خۆماڵییەکان نیشانەی مینیان لێ دانراوە ئەوانیش ئەو ناوچانە دەگـرێتـەوە کـە زیاتر لەسەر سنوورەکانن، وەکو کۆنە رێگا و کۆنە ربیە و گـوندێکی چۆڵ کـراو یاخـود خـاپور کـراو لەلایەن رژێمی بەعسەوە، یاخود ناوچە شاخاوییەکان و کۆنە گۆرستانەکان و کۆنە مۆڵگەی سەربازی. بۆیە بۆ ئەو پرۆسەیە واتە پرۆسەی مین هەڵگرتنەوە لە کوردستان چەندین رێگا هەیە لەوانە مین لابەر (دیمایـنەر) و ئامـێـر و کـەرسـتـە مـیکانیـیـەکـان و سـەگـە مین دۆزەرەوەکـان تەواوکـەری یەکـتـرین لە پرۆگـرامی هەڵگرتنەوەی مین لە کوردستاندا.

## چۆنیەتی دۆزینەوەی مین لە کوردستاندا

بۆ دۆزینەوەی مین لە کوردستان چەندین ڕێگا هەیە بەڵام باشترین ڕێگا و سەرکەوتووترین ڕێگا لە کوردستان بۆ دۆزینەوەی مین ڕێگای مین هەڵگرە، ئەویش بەهۆی ئامێری (کاشفة الغام) دەیدۆزێتەوە، چونکە دۆزینەوەی مین بەهۆی ئامێری گەورە کەمێک زەحمەتە، چونکە زۆربەی ئەو شوێنانەی کە مینیان لێیە لە کوردستان ناوچەی شاخاوی و بەرزن، ئەمەش زۆر زەحمەتە ئۆتۆمبیلی مین هەڵگر واتە شۆفڵ یاخود (کاسحة الالغام) بچێت مینی تێدا بدۆزێتەوە.

## سستی پرۆسەی هەڵگرتنەوەی مین

پرسیارێک کە دروست دەبێت بۆ زۆر کەس، لەبەرچی ئەو ماوە درێژەی کاری پاکسازی مین دەکرێت بەم شێوەیە لەسەرخۆ بەڕێوە دەچێت؟ لێرەدا بەچەند خاڵێک هۆکاری لەسەرخۆی پرۆسەی مین دەخەمە ڕوو:

هۆکاری یەکەم:

نەبوونی نەخشەی مین

گرنگترین کاری هەڵگرتنەوەی مین دەستنیشانکردن و دیاربوونی شوێنی مینە، کەچی تاوەکو ئێستا لە کوردستان بەبێ نەخشە کار بۆ هەڵگرتنەوەی مین دەکرێت، چونکە ڕژێمی لەناوچووی عێراق دانی بەوە نەدەنا کە لە کوردستان مینی چاندووە، هەر لەبەر ئەوەشە زۆر جار بەرپرسانی UN لەگەڵیان دانیشتوون و هەوڵیان دەدا ڕەزامەندیان وەربگرن، کە ئەو نەخشانەی لە سوپای عێراقی بەجێ ماون ئێستا هەیە ئەگەر بۆ حکوومەتی هەرێمیش نەبێت بۆ UN کۆپییەک بۆیان ڕەوانە بکرێت. کەچی ڕژێمی لەناوچووی عێراق ڕەزامەندی پیشان نەدەدا، نەک تەنها ڕەزامەندیان پیشان نەدەدا، بەڵکو هەروەک باسم کرد، دانیشی بەوە دانەدەنا کە مینیان لە کوردستان چاندبێ، چونکە ئەگەر دانی پێدا بنایە، ئەوە بۆ ڕژێمی عێراق بەڵگەیەک بوو دەبووایە نەخشەکەش تەسلیم بکات.

بەمەش پرۆسەی مین هەڵگرتنەوە خێراتر دەبوو. بۆ نموونە ئەگەر تیمێکی مین هەڵگرتنەوە ٩ مانگ خەریکی کێڵگەیەک بێتن ئەوا ٤ مانگ کاری ئامادەکاری بۆ کێڵگەکە دەکات ئەمەش پارەیەکی زۆری تێدا سەرف دەکرێ، تیمێکی تایبەت بۆ نەخشەدانان دەچێتە سەر کێڵگە بۆ ئەوەی سنووری کێڵگە دیاری بکەن، ئەم تیمانەش مووچەیان هەیە کاردەکەن وەکو تیمێکی مین هەڵگرتنەوە، بەڵام مین هەڵناگرن مەبەستیان تەنها ئەوەیە نەخشەی مین دابنێن، چونکە بەگوێرەی ڕێنماییەکانی UN ناکرێت دەست بە مین هەڵگرتنەوە بکرێت هەتا وەکو نەخشەی کێڵگەی مین دیاری نەکرێت و شێوازێکی ڕێک نەیەتە دامەزراندن بۆ هەڵگرتنەوەی مین، ئەگەر ئەم کێڵگە مینەش نەخشەی دیاریکرا دابەشی چەند بەشێک دەبێت و هەربەشێک کاری خۆی دەکات، بۆ پاککردنەوەی کێڵگەکە لەوانە بەشێک بدرێتە تیمی سەگ و بەشێکیان ئامێری میکانیکی بێتە ناو بەشێکیشیان بە مین هەڵگرتنەوە پاک بکرێتەوە، ئەم بەشانەش پارەیەکی زۆری دەوێت و تیمی تایبەتی دەوێت، بەڵام ئەگەر نەخشەمان هەبێت ئەوە ئەو مەسرەفانە هەمووی نامێنێت تەنها کاری پاکسازی مینی بۆ دەکرێت.

### هۆکاری دووەم

### شوێنی مین

شـەڕ و پێکدادانێکی زۆر کـرا لە کـوردسـتـان بەتایبەتی لەسەر سنووری عـێـراق و ئێـران، لێـرەدا دروست نییە بلێین کێڵگەی مین، بەڵکو پێویستە بلێن مین و کـێـڵـگەی شـەڕ و پێکدادان کـە هەردووکـیـان لێـرە لە سـەر یەک کـەوتوون. ئەگـەر کـێـڵگەی مـینی ئەوامـان هەبێت کـارەکـە لێـرە زۆر ئاسانتر دەبێت و خێراتر دەکرێت، چونکە وەکو وتمان ئەو ناوچانەی کـوردسـتـان ببـوون بەگـۆڕەپانی شـەڕ لەنێوان هەردوو وڵات، چەندین پاشماوەی تەقەمەنی تەقێندراو و نەتەقێندراو لەو شوێنانە بەجێ دەمان، کە لەگەڵ باردۆخی کوردستان هەمووی دەکەوێتە ژێر زەوی و ژێر چیـا و شـاخـەکـان. بەڵام ئەم کـێـڵـگە



مین وەک کەلوپەلی ناو ماڵ!

مینانەی سەر سنووری عێراق و ئێران زۆر پارچە ئاسنی ورد و گوللە هاون و فیشک و گوللەی نەتەقێنراو و تەقێنراوی زۆری تێدایە، ئەم پارچە ئاسنە وردانە کاری مین هەڵگرتنەوە لەسەرخۆ و تاخیر دەکەن. چونکە ئامێری سەرەکی کە بەکاردەیێن (Metal detector)ە مانای ئەم ئامێرەش ئەوەیە مادەی ئاسن دەدۆزێتەوە نەک مین، ئیتر ئەم کانزایەی کە دەدۆرزێتە دەکرێت پارچەیەک لە مین نەبێت و دەکرێ پارچەیەکیش بێت لە کانزایەکی بێ زەرەروزیان. ئینجا ئەگەر لە مەترێکی چوار گۆشە تەنها دوو مینی تێدا بێت، ئەوا ئامێری دۆزینەوەی مین تەنها لەو کاتەی بەسەر میندا تێپەر دەبێت ئینزاری بوونی مین لێدەدات کەچی ئەگەر پارچە کانزای تری تێدا بێت، جا هەر پارچە کانزایەک ئینزاری لێدەدات، ئەوەش مین هەڵگر بۆی نییە بڵێت ئایا ئەوە مینە یان نا، پێویستە بەپێی تەعلیمات کارەکەی ڕابگرێت و تەماشا بکات، بزانێ ئەو ئینزارە لەبەرچی بوو کە زۆربەی کاتەکانیش هەر پارچە کانزایەکە دەربهێنێت دوای دوو دەقە ئیشەکە ڕادەوستێت، چونکە دیسان ئینزار لێدەدات و پارچە کانزایەکی تر دەدۆزێتەوە. بۆ ئەوەی قیاسێک بکەین، لە ناوچە مین ڕێژکراوەکانی پارێزگای دهۆک، مین هەڵگر هەیە لەم ناوچانە لە یەک ڕۆژدا تاوەکو (٧٥) مەتری چوارگۆشەی کێڵگەی مینی پاککردۆتەوە، لەبەر ئەوەی ئەم

کێڵگانە تەنها مین ڕێژکراون و شەڕ و پێکدادانێکی وا لەوێ نەکراوە و پارچە کانزای وردی تێدا نییە. هەمان مین هەڵگر لە ناوچە سەر سنوورییەکانی حاجی ئۆمەران و چۆمان نەیتوانیووە هەتاوەکو (٥)مەتری چوار گۆشەش لە یەک ڕۆژدا پاک بکاتەوە لەبەر بوونی ئەم پارچە کانزایانە، کاتێک ئەو پارچە کانزایانە زۆر بن لە ڕادەبەدەر بن ئامێری مین هەڵگرتنەوە بەکار ناهێنرێت، ناچار دەبێت ڕێگایەکی تر یاخود شێوازێکی تری مین هەڵگرتنەوە بەکاربهێنن کە پێی دەڵێن (Full excavation) مانای هەڵکۆڵینی تەواو بەکاردەهێنن یانی کێڵگەمینەکە لە جێگای ئەوەی کە ئامێری مین هەڵگرتنەوە بەکاربێت، ئامێرێک وەکو چەقۆیەکی دەستییە یاخود بێڵێک (خاکەناس)ێک، بچووکی دەستییە خاکەکە هەڵدەکۆڵن و هەوڵ دەدەن بەم شێوەیە بچنە پێش. یانی کارەکە بە بێڵێکی بچووک لە ڕێگای دەستەوە دەکرێت، ئەم هۆکارەش کاتێکی زۆری پێویست دەبێت. ئەمەش یەکێکە لە هۆکارەکان کە پرۆسەی مین هەڵگرتنەوە لەسەرخۆ دەکات.

هۆکاری سێیەم

هۆکارێکی تر ئەوەیە ڕێکخراوەکانی مین هەڵگرتنەوە چ MAG یا UNOPES و یا ڕێکخراوە خۆماڵییەکان، ناچارن پەیڕەو و پرۆگرامێکی تایبەت پیادەبکەن کە پەیڕەو و پرۆگرامێکی نێوەدەوڵەتی

مین هەڵگرتنەوەیە، بەگوێرەی ئەم یاسا و ڕێسایانە ئەگەربێت و ئێمە کێڵگەی مینێکمان هەبێت ئەم کێڵگە مینە جۆری مینی کە تێدا دەدۆزیتەوە (ڤالمارا V69) بێت کە مینێکی زۆر پڕ مەترسییە یەکێکە لە مینە ساچمەدارەکان، ئەگەر بێت و ئەم مینە بتەقێتەوە تاوەکو ۱۰۰ مەتر بۆی هەیە خەڵک بریندار بکات، ئەگەر بێت وئەم جۆرە مینە لە ناو کێڵگەدا هەبێت بەگوێرەی یاسا و ڕێنماییەکانی مین هەڵگرتنەوە ماوەی نێوان دوو مین هەڵگر نابێت لە (۵۰م) کەمتر بێت، دیارە ئەگەر لەسەر مەترێک کەسێک دابنرێت کە دەبێت (۵۰) کەس لەسەر یەک کێڵگەی کە پێکەوە کاربکەن، پرۆسەی مین هەڵگرتنەوە ۵۰ جار خێراتر دەبێت، بەڵام بەداخەوە ئەم کارە نایەتەکردن! لەبەرئەوەی ئەگەر بێت و مینێک بتەقێتەوە مەترسی دەخاتە سەر هاوڕێیەکەی کە لەگەڵی لە هەمان کێڵگە کاردەکات و ناچار لەبەر پاراستنی گیانی مین هەڵگر، ماوەی ئەو ۵۰ مەترە خاڵی بەجێ بهێڵدرێت و هاوڕییەکەی لە ۵۰م دوورتر کار بکات. ئەمەش وەکو کێشەیەک دێتە بەر پرۆسەی مین هەڵگرتنەوە. چونکە کاری مین هەڵگرتنەوە کارێکی مرۆییانەیە. چونکە کاری مین هەڵگرتنەوە دوو جۆرە یەکێکیان مین هەڵگرتنەوەی سەربازییە کە لەشکری حکومەتەکان دەیکەن لەوانەیە قەبووڵی قوربانیش بکەن. جۆری دووەمیان مین هەڵگرتنەوەی مرۆییانەیە کە ئەمەیان قەبووڵی

قوربانی ناکات یانی بۆی نییە ژیانی مین هەڵگر بخرێتە مەترسی، کە لێرەدا زۆر کێشە دروست دەبێت وەکو ئەوەی کە باسمان کرد، یان ئەگەر بێت و ڕووداوێک بقەومێ کاری مین هەڵگرتنەوە لە تەواوی کێڵگەکان دەوەستێت، هەرچەندە کێڵگەی تر لەوانەیە ڕووداویشیان نەبێت، بەڵام بەگوێرەی ئەم ڕێنماییە لە تەواوی کێڵگەکان بۆ ئەم ڕۆژە لە کار دەوستێت هەتاوەکو هۆی ڕووداوەکە دیار نەکرێت و چارەسەر نەکرێت، ئەمەش هۆیەکی ترە بۆ ئەوەی پرۆسەی مین سەربەخۆ بڕوات.

هۆکاری چوارەم

هۆکاری چوارەمیش دیسان ڕژێمی عێراقی لەناوچوو بۆمانی دەنایەوە، ئەویش ئەوە بوو زۆر جار ڕێگای لە ستافی UN دەگرت کە دەهاتن بۆ کوردستان. بۆ نموونە چەند جار شارەزایان دەهاتن بۆ کوردستان بەتایبەتی شارەزایانی بواری مین، کە چۆن مین هەڵگرەکان فێریکەن لەژێر (خطوط الضغط العالي)دا ئیش بکەن، ژێر تاوەرەکانی کارەبای ضغط العالي لە مین پاک بکەنەوە، بەڵام ڕژێمی لەناوچووی عێراق ڤیزەکانیانی دوادەخست و ئەم کارەش دەبووە هۆی ئەوەی دیسان کارەکە فەشەل بهێنێ. هەروەها لەلایەکی تر باسی گرفتێکی تر بکەم ئامێرێکی هەڵگرتنەوەی مین کە ئامێرێکی میکانیکییە لە وڵاتی باشووری ئەفریقیا بۆ کوردستان هاتبوو، ئەم ئامێرە نزیکەی دوو ساڵ

مۆڵەتی پێ نەدرا بێتە ناو کوردستان، یەکەم جار لە ئەردەنەوە مایەوە دوایی کە هاتە عێراقیش لە دەوروبەری شاری بەغدا ماوەیەکی زۆر بێ ئیش مایەوە، ئەمەش پارەیەکی یەکجار زۆری لێ سەرف کرا بۆ کرێی ئەم ئامێرە.

هۆکاری پێنجەم

بەیەکێک لە گەورەترین هۆکار دەژمێردرێت ئەویش کێشەی (٥)کیلۆمەترییە. کاتی خۆی ڕژێمی لەناوچووی عێراق ڕێگای بەهیچ ڕێکخراوێکی مین هەڵگرتنەوە نەدەدا لە کوردستان ئەو ناوچانەی کە دەکەوێتە سەر سنوور بەپانایی (٥)کم لە مین پاک بکەنەوە، ئەمەش بەپێی پەیمانێک بوو لەنێوان UN و ڕژێمی ڕووخاوی عێراق نابێت نزیکی ئەم ناوچانە ببنەوە کە دەکەونە ئەم هێڵە، ئەم ناوچانەش چەندین گوند لەخۆی دەگرێتەوە بەزۆرترین و پڕترین شوێنی مین دادەنرێت لە کوردستاندا.

## مین و کێشەکانی لە کوردستان

مین دەبێتە هۆکارێکی سەرەکی لەبەردەم زۆر نیشوکاری ڕۆژانە بەتایبەتی لەم بوارانەدا:

١- گەڕان بەشێوەیەکی سەرەکی (بۆ کاروباری ڕۆژانە، سەردان، ڕاو، گەشت... هتد)

٢- ئاوەدانکردنەوەی گوند و خانووبەرەی کاولکار.

٣- بازرگانی.

٤- پێشکەشکردنی خزمەتگوزاری گرنگ.

٥- گواستنەوە و گەیاندنی یارمەتی مرۆیی.

٦- سوود وەرگرتن لە کێڵگە و باخ و بەرهەمەکانیان.

٧- سوود وەرگرتن لە دار و درەختی سروشتی.

٨- سوود وەرگرتن لە لەوەڕگە بۆ لەوەڕاندنی ئاژەڵ.

٩- سوود وەرگرتن لە سەرچاوەی ئاو.

ئەو هۆکارانەش کاریگەریان هەیە بۆ مرۆڤ دەبنە سێ هۆکاری سەرەکی کە ئەمانەن:

١- هۆکاری دەروونی (نەفسی)

بوونی مین لە ناوچەکانی کوردستان بۆتە دروستبوونی حاڵەتێکی سایکۆلۆژی ناخۆش، ئەم کێشەیە ترسی بەردەوامی دروستکردووە لەبیر و هۆشی بەشێکی زۆری جووتیاران، منداڵان، ئافرەتان، پیاوان دڵەڕاوکێیەکی بەردەوامی دروستکردووە، ئەمانە هەمیشە لە حاڵەتی نائارامیدا دەژین بەتایبەتی منداڵان و ئافرەتانی

سک پڕ کە پاشماوە کاریگەرەکانی بۆ دوارۆژ بەخراپ دەنگ دەداتەوە، ئەم حاڵەتە وا دەکات کە جووتیاران خۆیان بەخاوەنی زەوییەکانی باب و باپیرانیان نەزانن، هاوکات بەهۆی تەقینەوەی مینەکان لەژێر پێی هاوڵاتیان گرفتێکی زۆر هاتە دروست بوون، کە بە سەدان هاوڵاتی بێ تاوان، لە تەمەن و ڕەگەزی جیا تووشی پەککەوتەیی بوون ئەندامێک یان چەند ئەندامێکی لەشیان لە دەستدا، لە کاری ڕۆژانە دابڕان و تووشی هەژاری و نەداری بوون، وێڕای ئەمەش زۆر لە مرۆڤە پەککەوتووەکان خێزاندارن و ئەرکی بەخێوکردنی ماڵ و منداڵیان لە ئەستۆدایە، جگە لەو گەنجانە کە لە هەرەتی لاوێتیدا ڕووبەڕووی ئەم گرفتە بێ ئەمانە دەبنەوە و هەردەم لەناو کۆمەڵگەدا هەست بەشەرم و دابڕان و دوورەپەرێزی دەکەن، بەتایبەتی ئافرەتانی کەم ئەندام و ئەو کچانەی شیرینی ژیانی هاوسەرێتیان نەچەشتووە، بەهۆی کەم ڕۆشنبیری هەندێ لە پیاوانیشەوە زامی برینەکە پتر قووڵ دەبێتەوە، بەتایبەتی پیاوی وا هەیە هەر کە خێزانەکەی بەهۆی کارەساتی مین تووشی پەککەوتوویی دێت، لەبری ئەوەی دڵی بداتەوە هاوبەشی خەمی بێت و بەدوای چارەسەرکرنیدا بگەڕێت. یەکسەر ژنێکی تر دێنێت و ئافرەتە پەککەوتووەکەش کە خاوەن منداڵە، پشتگوێ دەخات.

پەککەوتوویی هەمدیس بۆ پیاوانیش هەمان گرفت

دەنیێتەوە و زۆربەی لاوەکانمان تەنیا لەبەرئەوەی یەکێک لە ئەندامەکانی لەشیان بەهۆی مینەوە لە دەست داوە بە ڕەبەنی ژیان دەبەنە سەر، ئەمەش وا لەو کەسانە دەکات کە پەککەوتوون بەهۆی مینەوە هەردەم دڵ گران و نارەحەت بن تووشی نەخۆشییەکی دەروونی دەبنەوە لەناو خۆیاندا.

٢- هۆکاری کۆمەڵایەتی:

زۆری مین لە ناوچە شاخاوییەکان و پێدەشت و چیاکاندا وا لە گوندنشینەکان دەکات ماڵ و حاڵی خۆیان جێ بهێڵن، ئەم جێهێشتنەش دەبێتە هۆی تەسکبوونەوەی ڕووبەری کوردستان، ئەمەش لەگەڵ گەشەی زانستی کۆمەڵدا ناگونجێت و بارێکی ناهاوسەنگ لەنێوان دابەشبوونی جوگرافی تاک و کۆمەڵ و زەوی دروستدەکات. زیادبوونی دیاریدەی کۆچ لە گوندەوە بۆ شار، لە ئەنجامدا رێژەی دانیشتوانی شارەکان زیاد دەکات بەبێ پلان، ئەمەش دەبێتە هۆی دروستبوونی بێ کاری زیاترو وا لە گەنجەکان دەکات ڕوو لە هەندەران بکەن، هەروەها دەبێتە هۆی ئەوەی دیاریدەی سواڵکردن زیاد ببێت، ئەمەش لە ئەنجامی ئەوەی کەم ئەندامی مین ناتوانن هیچ بەشدارییەکی ئابووری کۆمەڵایەتی بکەن و بەشێک لە خێزانەکانیان ناتوانن بەخێو بکەن، هیچ جێگایەکیش نییە بۆ حەوانەوەیان، ئەمەش ڕووی کۆمەڵایەتی کوردەواری ناشرین دەکات و کەلتوور و دابوونەریتی کورد هەڵدەوەشێنێتەوە.

زیادبوونی کێشەی تەڵاق، بێوەژن، منداڵانی سەر شەقام، ئەمەش کاریگەری خراپ دەکاتە سەر کەمئەندامان و خێزانانی قوربانیانی مین بارگرانییەکیشە بۆ سەر کۆمەڵ. جگە لەمانەش کێشەی مین حاڵاتێکی دوورە پەرێز دروست دەکات لەنێو خزم و دۆستان دا.

٣- هۆکاری ئابووری:

هۆی سەرەکی نەگەڕانەوەی خەڵک بۆ ماڵی خۆیان مینە! ئەو مینانە رێگە لە جووتیاران دەگرێت کە بچن بۆ ئاوەدانکردنەوەی گوند و شارۆچکە و چیا و دۆڵ و ڕەز و باخەکانی خۆیان پاش ڕاپەڕین جووتیاران بۆ ڕزگاربوون لەو بارە قورسەی ئابووری و بۆ ئاوەدانکردنەوەی گوندەکانیان چوونە سەر جێگەی باب و باپیرانیان، بەڵام مەترسی مین کێشەیەکی گەورەی بۆ دروستکردن بەوەی جووتیاران ناتوانن زەوییەکانیان بکێڵن و مەڕ و ماڵات بەخێو بکەن و بەمەش گوزەرانیان زیاتر ڕووەو دابەزینە و پاش ئەوەی سەدان کەس بوونەتە قوربانی مین و هەزارانیش کەمئەندام بوون، بەمەش داهاتی گشتی حکوومەت کەم دەکات و ڕێگا لە پرۆژە کشتوکاڵییەکان و پرۆژەی ئاو، رێگاوبان و کارەبا دەگرێت.

دابڕانی بەشێکی گەشتوگوزاری فراوان بەتایبەتی ناوچەی پێنج کیلۆمەتری قەدەغەکراوی کوردستان چەندین دیمەن و شوێنی جوان و تاڤگەی لێیە، بەڵام

ئەم کێشەیە وای کردووە خەڵکی نەتوانن پشووی خۆیان بەئارامی بەسەربەرن و گەشتی خۆیان بکەن بۆ ناوچەی شاخاوی و دۆڵ و تاڤگەکان، سنووری کوردستان- ئێران کوردستان حکوومەتی عێراق.

کەمبوونەوەی هێزی مرۆیی کورد لە بەرهەمهێنان و ئاوەدانکردنەوەی کوردستان دیارە هەر کەمئەندامێکی مین هیچ جیاوازی نییە لە قوربانی مین، چونکە ناتوانێ بەشداریەکی هەبێت لەبەرهەمهێنان و چالاکییە کۆمەلایەتییەکانی کوردستان، جگە لەوەی کە کێشەی تایبەت بۆ خۆیان و خێزانەکانیان دروست دەکەن، حکوومەتیش بەبێ پێویست ناتوانێت مافەکانیان دەستەبەر بکات، بەمەش بەشێک لە توانای گشتی هێزی مرۆیی کورد کەم دەبێتەوە.

هەموو ئەم هۆکارانە مرۆڤ ساردەکاتەوە کە نەچێتەوە سەر زەوی و باخ و بیستانەکانیانی خۆیان، ئەمەش دەبێتە گورزێکی گەورە بۆ ئابووری وڵات، چونکە مرۆڤی تووشی ترس و دڵەراوکێ کردووە بەهۆی چاندنی مینەوە. ماوە ئەوەش بڵێین کە لەو شەڕە بێ ئەنجامەی نێوان عێراق و ئێران ٢٠ ملیۆن مینیان بەهەردوو وڵات لە کوردستان چاند کە ئێستا نزیکەی ١٢ ملیۆنی ماوە واتە هەر کەسێک لەم مینانە ٣ سێ مینی بەردەکەوێ ئەمەش ئەنجامێکی زۆر ترسناکە.

## بەخێرایی کارەساتی مین

- ساڵانە نزیکەی ٢٦ هەزار کەس لە سەرانسەری جیهان دەبنە قوربانیی مین.

- لە هەشتاکاندا دوو ملیۆن کەس بە مین گیانیان لە دەست داوە و ٥ ملیۆن منداڵ کەم ئەندام بوون و ١٥ ملیۆن منداڵ تووشی نەخۆشی دەروونی هاتوون.

- مین ڕێ لە ٢٠ ملیۆن دەربەدەر دەگرێ کە دەیانەوێ لە ٣٥ وڵاتدا بگەڕێنەوە سەر ماڵ و حاڵی خۆیان.

- هەر ٢٢ دەقیقە جارێک کەسێک دەبێتە قوربانیی مین.

- مین لە زۆر وڵاتی جیهانی سێیەمدا ڕێگرە لەبەردەم دروستکردنی سکەی شەمەندەفەر و ڕێگاوبان و بەکارخستنەوەی وێستگەی کارەبا و ڕێی ئاوی و کەنارەکان و چیا و دارستانەکان.

- ١٩٩ ملیۆن مین لە ٧١ وڵات لە جیهان چاندراوە.

- ١٥ وڵات بەوڵاتی پەککەوتوویی دەژمێردرێت لە جیهان بەهۆی مینەوە.

- ئەو مینە چێندراوە لە جیهان وا دادەنرێت کە لەناو هەموو ٤٨ کەسێک یەک کەس مینی بەردەکەوێ.

- مین لە مانگێک ٨٠٠ کەس دەکوژێت، ١٢٠٠ کەس بریندار دەکات، مانای لە مانگێکدا لە جیهان

٢٠٠٠ بەرکـــەوتوو دەبێت واتە هەر دەقـــەیەک قوربانییەک.

- لە ٥٠٠٠ مین یەکـێک لە شـارەزایاکـانـی مین دەرهێنەری مین لە جیـهـان دەکـوژێت، هەروەها دوو لەو شارەزایانەش دەبنە پەککەوتەی مین.

- مین جیـاوازی ناکات لەنێـوان قـوربانیـانی بۆیە زۆربەی بەرکەوتەکانی مەدەنین.

- مـــینی چێندراو نزیکەی ٨٤ ملیـــۆن دەبێت هەمـــوو ســـاڵێکیش لەنێـــوان ٢ تاوەکـــو ٥ مین دەچێندرێت ئەو رێژەیەش رێژەیەکی زۆرە دەبێتە هۆی پیسبوونی ژینگە.

- مین بریندار و کوشـتـاری ١٠ ئەوەندەی بریندار و کوشتاری جەنگە.

- مین تەمـەنی زۆر درێژە بـۆیە زۆربەی مین کـــە دۆزراوەتەوە تەمەنیان لە ٥٠ ساڵ زیاترە.

لە کۆتاییـدا دەڵێین مین تەڵەیەکە بۆ بەکـارهێنانی چونکە ئەو مـینەی نرخـەکـەی تەنهـا ٣ دۆلارە ٣٠٠ دۆلاری پێویستە بۆ هەڵگرتنەوەی.




نیشانەی مین



جۆرەکانی مین



نەخشەی ناوچە مەترسیدارەکانی مین لە کوردستانی عێراق



نەخشەی ڕووداوەکانی مین لە کوردستانی عێراق




کاریگەری زۆری مین لە کوردستان بەراورد لەگەڵ
ناوچەکانی تری عێراق

ئاماری بەرکەوتووان بریندار و کوژراو لە ساڵی ١٩٩٢ تا ٢٠٠٣ بەپێی تەمەن و ڕەگەز لە کوردستان کە لە ڕێبەری چاودێری سەلامەتی کۆما وەرگیراوە

| سال | تەمەن ١-١٠ | | تەمەن ١١-٢٠ | | تەمەن ٢١-٣٠ | | تەمەن ٣١-٤٠ | | تەمەن ٤١-٥٠ | | تەمەن ٥١-٦٠ | | تەمەن ٦١..سەد | |
|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|
| | کوژراو | بریندار | کوژراو | بریندار | کوژراو | بریندار | کوژراو | بریندار | کوژراو | بریندار | کوژراو | بریندار | کوژراو | بریندار |
| ١٩٩٢ | ٧٢ | ١٥٠ | ١٩٨ | ٢٨٠ | ١٢٨ | ١٧٣ | ٧٢ | ١٢٨ | ٣٨ | ٦٠ | ٢١ | ٣٥ | ١٧ | ١٩ |
| ١٩٩٣ | ٣٧ | ٩١ | ١٤٦ | ٢٢٨ | ٨٨ | ١٦٠ | ٥٢ | ٦٨ | ٤١ | ٦١ | ٢٨ | ٢٧ | ٩ | ٨ |
| ١٩٩٤ | ٣٦ | ٨٣ | ١١٩ | ٢٠٤ | ٩٩ | ١٨٣ | ٤٣ | ٧١ | ٤٥ | ٧١ | ٣٣ | ١٩ | ١٥ | ١١ |
| ١٩٩٥ | ٥٤ | ٧٧ | ١٣٧ | ١٨٩ | ٨٥ | ١٦٧ | ٣٩ | ٧٦ | ٢٨ | ٦٨ | ١٧ | ٢٤ | ١٩ | ١٨ |
| ١٩٩٦ | ٣٧ | ١٢٢ | ٨٨ | ٢٤٤ | ٨٧ | ١٧٦ | ٣٨ | ٦٦ | ٢٧ | ٦٣ | ١٠ | ٢٥ | ١١ | ١٣ |
| ١٩٩٧ | ٢١ | ٧٣ | ٩٩ | ٢٠١ | ٧٧ | ١٤١ | ٢٥ | ٥٩ | ٢٧ | ٦٨ | ١٠ | ٢٤ | ١١ | ١٣ |
| ١٩٩٨ | ٢٣ | ٥٨ | ٥٩ | ١٥٢ | ٥٨ | ١٤٦ | ١٨ | ٥٢ | ٢٢ | ٥١ | ٩ | ١٥ | ٨ | ١٨ |
| ١٩٩٩ | ١٩ | ٤٤ | ٥٩ | ١٢٥ | ٣٥ | ٨٤ | ١٢ | ٢٧ | ١٥ | ٣٣ | ٥ | ١١ | ٤ | ٩ |
| ٢٠٠٠ | ٣ | ١٦ | ١٠ | ٢٧ | ٨ | ١٢ | ٢ | ٧ | ٢ | ٥ | ١ | ٣ | ٣ | ٥ |
| ٢٠٠١ | ٥ | ٢٠ | ١٠ | ٥١ | ١٠ | ١٦ | ١ | ١٠ | ٣ | ١٠ | ٠ | ٤ | ٠ | ٢ |
| ٢٠٠٢ | ١ | ٦ | ٧ | ٢٢ | ٦ | ١٦ | ١ | ٨ | ٠ | ٣ | ٢ | ٨ | ٠ | ٢ |
| ٢٠٠٣ | ٠ | ٦ | ٦ | ١٥ | ٤ | ١٨ | ٠ | ١٦ | ١ | ٤ | ١ | ٩ | ١ | ٦ |

## سەرچاوەکان

### کوردییەکان

١- زۆربەی نامیلکەکانی ڕێکخراوی M A G.

٢- ڕێککەوتننامەی قەدەغەکردنی بەکارهێنان و ئەمبارکردن و بەرهەمهێنان و گواستنەوەی مینی دژ بەتاکەکەسان و لەناوبردنی ئەو جۆرە مینە.

٣- نامیلکەی (ڕێبەری چاودێری سەلامەتی ڕێکخراوی کۆما، چاپخانەی پەروەردە- هەولێر، چاپی سێیەم، ٢٠٠٤.


### عەرەبییەکان

١- د. هشام البرهاني، الألغام عدو يسبب الاعاقة أو الوفاة، يونسيف- سوريا.

٢- الألغام الأرضية و الذخائر غير المتفجرة، دليل السلامة، الإمم المتحده- انترنيت

٣- العميد طلعت نوري على، حرب الالغام، مكتبة الوطنية بغداد، سنة ١٩٨٦.

٤- ملخص تنفيذي، تقرير منظمة رصد الألغام الأرضية.


### ئینگلیزییەکان

- Report ICRC

- Report UN

- The History of Londmines

- Demining- Process_Interview with Siraj Barzani

- For Background Information only UNOPS Mine Action Programme in Northern Iraq.

- History of Mine

- The Problem

## ڕۆژنامەکان

### کوردییەکان


١- ئەمیر داود، کێڵگەکانی ئەهریمەن، گولان، ژمارە (٣٩٦)، ٢٠٠٢/٨/٢٢.

٢- ئەمیر داود، مین لە شەڕە هاوچەرخەکان، مێژووی لە کوردستان، گولان، ژمارە (٤٠٠)، ٢٠٠٢/٩/١٩.

٣- د. ئەحمەد مەوسەوی. و. کەمال غەمبار، قوربانییەکانی مین و مافی مرۆڤ، برایەتی ژ ٣٢٣٧، شەممە ٢٠٠٠/١١/١٨.

٤- ئیسماعیل گوندەژۆری (گەشتێک بۆ گوندی مەران) تەمەنی ٣٠٠ ساڵە و لەبەر مەترسی مین تەنها ٢٠ ماڵی تێدا نیشتەجێن، برایەتی.

٥- نارام ئیسماعیل (قسەیەک لەسەر ئایندەی مین پەرستان)، کوردستانی نوێ.

٦- ئاسۆ، ئامێری نۆما داهێنانێکی کوردستانی بۆ دۆزینەوەی مین، یەکگرتوو، ژ ٣٨٥ ٢٠٠٢/٤/٢٦.

٧- ئالا عومەر (ڕیپۆرتاژی مین) برایەتی، ژ ٣٥٤٢، ٢٠٠١/١١/١٨، برایەتی .

٨- بەرهەم عەلی کارەساتی هەزارەی سێیەم: چەکە کۆمەڵکوژەکان هەڕەشە لە مرۆڤایەتی دەکەن، برایەتی، ژ ٣٢١٨، پێنج شەممە ٢٦/ ١٠/ ٢٠٠٠.

٩- بەرهەم عەلی، بۆ یەکەمین جار لە کوردستاندا (سەگی خۆماڵی بۆ دۆزینەوەی (مین) بەکاردەهێنرێت، برایەتی چوارشەممە ٢٠٠٠/٤/١١.

١٠- بەرهەم عەلی، مین و مەرگی ئامادە، برایەتی، ژ ٣٢٣٨، ٢٠٠٠/١١/١٩

١١- بۆتان تەحسین ، گەرمی بازاڕی کێشە نێودەوڵەتییەکان، برایەتی.

١٢- بۆتان تەحسین، کێڵگەیەک چوار ساڵان کراوە بەشینایی و کێڵدراوە، کەچی ڕێکخراوی ELS تازە پاکی دەکاتەوە!!، میدیا، ژ ٩١، ١/٤/٢٠٠١.
١٣- جەعفەر گوانی، ناوچە کوێستانییەکان هێشتا هەڕەشەی (مین)یان لەسەرە و ڕێکخراوەکانیش خەمساردن، برایەتی، ژ٣٢٢٨، ١٩/١١/٢٠٠٠.
١٤- جۆن هیمینگ (بەهۆی کارەساتی مین تا ئێستا لە کوردستان ٣٧٠٠ کەس کوژراون و ٧٥٠٠ کەسیش کەم ئەندامن، برایەتی.
١٥- و. چیمەن سالح (کوردستان پەرژینی مینی بۆ کراوە)، برایەتی، ژ٣٨٧١، ٣/٩/٢٠٠٢
١٦- ڕاگەیاندنی بەڕێوەبەرایەتی مین هەڵگرتنەوەی سلێمانی، مین مەرگی شاراوە، کوردستانی نوێ، ژ ٢٨٣٨، ١٩/٨/٢٠٠٢.
١٧- ڕشید، کاری ڕاکرنا (مین)ا، دێ کەنگێ بەدویماهی هێت؟! برایەتی، ژ ٣٠٩٣، پێنج شەمە ١٨/٥/٢٠٠٠.
١٨- ڕشید، دەمەکێ درێژ پێدڤییە هەتاکو کوردستان ژ (مین) بێتە پاقژکردن، برایەتی ژ ٣٢٢٨، یەکشەمە، ١٩/١١/٢٠٠٠.
١٩- ژیان ڕواندزی، ئەندێشە کۆمەڵایەتییەکانی کەمئەندامان و کارەساتی (مین)، ڕێگای کوردستان ژ. (٥٠٨)، ٢٤/ حوزیران/٢٠٠٢.
٢٠- عەبدوڵلا سابیر، و ئاوات ئەحمەد (لە دامێنی حەوت کێڵگەی مینەکەدا بەشی یەکەم، هاوڵاتی ژ. ٧٦، دووشەمە ١٠/٦/٢٠٠٢.
٢١- عەبدوڵلا سابیر، و ئاوات ئەحمەد (لە دامێنی حەوت کێڵگەی مینەکەدا بەشی دووەم، هاوڵاتی ژ ٧٧ دووشەمە ١٧/٦/٢٠٠٢.

٢٢- عەنبەرین زەمان، و. دارا فەرەج (تاکو ئێستا پاشماوەی مینە شاراوەکانی ناو خاکی کوردستان بۆ کوردەکان جێی مەترسین)، کوردستانی نوێ. ژ ٢٨٢٨، ٢٠٠٢/٨/٧

٢٣- سەمیرە عەلی حەسەن (کۆمەڵەی ڕۆژ)، کوردستانی نوێ، ژ ٢٨١٤، ٢٠٠٣/٧/٢٢

٢٤- سەروان بارزانی، مەینەتەکانی گەلی کورد، ڕاپۆرت ساڵی ٢٠٠٢، ئیسپانیا.

٢٥- سیروان غەریب (هەورەمان لەژێر ڕەحمەتی میندا)، هاوڵاتی، ژ ٨٠/ ٢٠٠٢/٧/٨

٢٦- عوسمان ڕیشە (خەمێکی دی مرۆڤ و مین و سەگ) برایەتی.

٢٧- فوئاد عەلی ئەحمەد، مین و کێشەی قوربانییانیی لە کوردستاندا، کوردستانی نوێ. ژ ٢٨٥٣، ٢٠٠٢/٦/٤.

٢٨- محەمەد حاجی کەریم، کاریگەرییە سلبییەکانی مین لەسەر ئابووری کوردستان، برایەتی، ژ ٢١٤٩، یەکشەمە ٢٠٠٠/٨/٦.

٢٩- محەمەدی حاجی کریم، لە ئامێری پتر لە (١٠) ملیۆن (مین)دا، برایەتی، ژ ٣١٣٤، یەکشەمە ٢٠٠٠/٧/١٦.

٣٠- محیەدین قادر، ڕێبوارتاژ لەسەر مین، برایەتی، ژ ٣٨٤٠، دووشەمە ٢٠٠٣/١١/١١.

٣١- محیەدین قادر، ( ڕێپۆرتاژی مین) برایەتی، ژ ٣٧٩٢، ١٦/ ٢٠٠٣/٩.

٣٢- محیەدین قادر (ڕێپۆرتاژی مین) برایەتی

٣٣- مەهاباد عەبدوڵلا (هیران لە مین پاک نەبۆتەوە، برایەتی ژ ٣٢٣٨، ٢٠٠٢/١١/١٨.

٣٤- هەواڵنامەی UNOPS زۆربەی ژمارەکانی.

٣٥- هەواڵنامەی KOMA کە لەلایەن ڕێکخراوی کوردستان سلێمانی دەردەچێ دوو ژمارەی.
٣٦- هاوژین حەمە ڕەشید- هەندرێن شێرزاد (ڕیپۆرتاژی مین) برایەتی، ژ ٣٨٦٣، ٢٠٠٢/١٢/١٠.

### عەرەبییەکان

١- بهزاد جهاد فائق، (ضريبة التكنولوجيا الألغام)، خەبات، عدد ١٠٥٥، ٢٠٠١/١٢/٧.
٢- شؤون كرديه، الدكتاتورية زعمت كردستان جنة العراق فزرعت فيها (٢٠) مليون لغم قاتل، اتحاد.
٣- عبدالحميد اليحياوي، الموتمر الدولى لمكافحة الألغام ضد الأفراد يفتتح وسط خلافات حادة، الشرق الوسط، عدد ٦٧٨٤، ١١/ ١٩٩٧/١٠.
٤- محمد على سيد، حدائق الشيطان في مصر والعالم، اخبار الحوادث، ٢٠٠٢/٢/١٤.
٥- محمد رشوان (الألغام تزهق الارواح و تعطل التنمية) الرأى العالم ٢٠٠٢.
٦- محمود الزيات (الغام و من مخاطرها على المدنيين في لبنان... حقائق وارقام، الاتحاد الاماراتي، ١٩٩٩/٨/١.
٧- فادى الغوش (الالغام والقوانين الدولة)، انترنيت
٨- هاني شادي (اطفال شيشان الغام الحرب المنسية)، لوس انجلوس تايمز.
٩- لقاء مع المسؤول الاعلامي لمكتب ازالة الغام فى كردستان العراق، اتحاد، عدد ٤٩٧، ٢٠٠٢/١١/١.
١٠- وكالات انباء (مكفأة لجهود ديانا- نوبل السلام من نصيب حملة «الالغام سلاح الجبناء». شرق الاوسط، ٦٨٩٢، ١١/ ١٩٩٧/١٠.

# پێزانین

لێرەدا بەچاکی دەزانم سوپاس و پێزانینی خۆم ئاراستەی ئەو بەڕێزانەی خوارەوە بکەم کە لەم کتێبەدا یارمەتیان داوم، سەرەتا زۆر سوپاسی کاک سراج بارزانی دەکەم کە چەندین زانیاری گرنگی پێدام هەروەها سوپاسی برای بەڕێزم کاک بەدران ئەحمەد حەبیب دەکەم، سوپاس بۆ هەموو کارمەندانی دەزگای ئاراس، بەتایبەتی نەخشەساز کاک ئاراس ئەکرەم و حاجی دلاوەر صادق، سوپاس بۆ هەموو کارمەندانی دەزگای هەرێم بۆ مین هەڵگرتنەوە بە تایبەتی عەلی حەمەدەمین و عەلی غازی، سوپاس بۆ برای رۆژنامەوان بۆتان تەحسین، سوپاس بۆ برای نووسەر و وەرگێر ئازاد حەمە شەریف کە دەرگای ئەرشیفی خۆی بۆ کردمەوە بۆ سەرچاوەکان لەگەڵ چەند زانیارییەکی گرنگی پێ بەخشیم. سوپاس بۆ شاخەوان کەرکوکی، هەروەها سوپاس بۆ عادل زرار لە رێکخراوی کۆما ، سوپاس بۆ برایانم رەهێل رمشید و کەهی ئامێدی لە وەزارەتی مافی مرۆڤ - هەولێر بۆ یارمەتیدانیان، لە کۆتاییدا سوپاس بۆ برای بەڕێزم کاک سەروان بارزانی کە راپۆرتێکی خۆی لە ئیسپانییەوە بۆ وەرگێڕامە سەر زمانی کوردی.



بۆ هەر لایەکی ئەم وڵاتە دەڕۆییت مەرگێک چاوەڕێتە، لەنێو هەر شاخێک و چیا و قەدپاڵ و لاپاڵێکی ئەم وڵاتە، لەنێو هەر دەشتێک و کەنار و ڕووبارێکی ئەم کوردستانە چەندان تەلبەندی دڕکاوی دروست کراوە، هێمای مەرگێک لە تەنیشتیانەوە خۆی مەڵاس داوە. مینە جۆراوجۆرەکانی ئەم خاکە چاوەڕوانی دەست و قاچی تۆلازی کورد و منداڵی کوردە بۆ ئەوەی بگەنە سەری و بیان تەقێنێتەوە. ئەو مەرگە دەماودەمە تاوەکو ئێستا هەر ماوە هەر دەمێنێ لە کوردستان، دوژمنانی گەل و دوژمنانی مرۆڤی کورد لە جیاتی گوڵ و نەمام بچێنن! مین و تەقەمنیان بۆ چاندووین لە کوردستان.